حکومەتی هەرێمی کوردستان

وەزارەتی رۆشنبیری

بەرێوەبەرێتی خانەی وەرگێڕان

زنجیرە (46)

# چوار وتاری شیشرۆن

نووسینی:

رحمەت الله مقدم مراغه ای

وەرگێرانی:

شۆڕش جوانڕۆیی- کامیل ئەحمەد بەگ

سیسرون

چهار خگابه از سیسرون

ترجمه:

رحمت الله مقدم مراغه ای

چاپخانه:

تمدن بزرگ- تهران- انتشارات جاویدان



**وەزارەتی رۆشنبیری**

**بەڕێوەبەرێتیی خانەی وەرگێڕان**

www.roshnbiri.org

khanaywargeran@yahoo.com



- ناوی کتێب: چوار وتاری شیشرۆن
- نووسینی: رحمەت الله مقدم مراغەای
- وەرگێڕانی لە فارسییەوە: شۆڕش جوانڕۆیی- کامیل ئەحەمەد بەگ
- تایپ و نەخشەسازیی کۆمپیوتەری: شیلان نوری
- نەخشەسازیی بەرگ: نازەنین ساڵح
- زنجیرە: ( 46 )
- تیراژ: 1500 دانە
- چاپ : چاپخانەی دیلان
- ژمارەی سپاردنی ( 117 )ی ساڵی (2004)ی وەزارەتی رۆشنبیریی پێدراوە
- چاپی یەکەم: 2004- سلێمانی

## پێڕست

1-پێشەكی وەرگێڕ.............. 16 - 7
2-ژیاننامەی شیشرۆن.............. 20 - 17
3-وتاری یەكەم.................. 47 - 21
4-وتاری دوهەم.................. 68 - 48
5-وتاری سێهەم.................. 89 - 69
6-وتاری چوارهەم.................. 112 - 90

**پێشكەشە:**

**بەهەردوو ئازیزم..**

***رێبین ئەحمەد هەردی**

***ئاراس فەتاح**

# پێشەكی

چوار وتار لەوتارەكانی "شیشرۆن" كە دژ بە"كاتلینا"نووسیوێتی ئەگەرچی لەدیدگای مێژووەوە تەنها دۆزینەوەی پیلانێكی سیاسیە, بەڵام لەهەمان كاتدا بەناوبانگترین وتارەكانی مێژووەو هەروەها جوانترین بەرهەمە كلاسیكیەكانی رۆمای دێرینە. شیشرۆن بە توانای دەربڕینو ڕەوانبێژی خۆی بەنووسینی ئەم چوار وتارە وڵاتەكەی لە پیلانێكی گەورەو بەربڵاو, ڕزگار كرد. لەراستیدا جەنگی شیشرۆنو كاتلینا لە چەشنی خۆیدا جەنگێكی بێوێنە بوو. لەلایەكەوە لۆژیك و تەقواو عەشق بەگەل, لەلایەكی دیكەشەوە, پلەوپایە پەرستیو دڵڕەقیو پیلانو دەسیسە دانان لەبەرامبەر یەكدا وەستابوون. چەكەكانی ئەم جەنگەش لە چەشنی خۆیدا بێوێنەبوو, چونكە لەلایەكەوە پیاوێكی بەساڵاچوو بە جلو بەرگی دادوەریەوە وەستابوو كە جگە لە بیروباوەڕی پاكو زمان پاراوی چەكێكی دیكەی نەبوو, لەبەرامبەریدا جەنگاوەرێكی خۆڕاگر وەستابوو كە بەشمشێرو ڕمو هەموو كەرەسەیەكی جەنگییەوە خۆی پڕچەك كردبوو كە لەهونەری دەسیسەدانانو پیلانگێڕی بەتەواوی شارەزابوو. پیاوانی ئەم دووگروپەش لەگەڵ یەكدا جیاواز بوون, چونكە لەلایەكەوە خەڵكانێكی ئاسایش خواز ڕاوەستابوون, كە ئاسایشو ئاشتییان خۆش دەویستو ژیانی ئاسایی خۆیانیان نەدەكردە قوربانی هەواو هەوەسی شەڕانگێزانە, لەلایەكی دیكەوە پیاوانێكی شەڕخواز





وەستابوون كە جگە  لەجەنگو گەندەڵیو دەستدرێژكردنە سەرماڵو ناموسی خەڵكی ئارەزوویەكی دیكەیان نەبوو. دانبەخۆداگرتنو تەگبیرو ڕاستگۆیی شیشرۆن بوونە هۆی ئەوەی كە لە جەنگێكی وەهادا "هەق بەسەر شمشێردا زاڵبێت" ئەوشتەی كە هەمیشە ئەگەری ڕوودانی حەتمی نییە.

كاتلینا ئەو پیلانگێڕەی دژی حكومەت ڕاوەستا لە چینی خانەدانو پیاوێكی جەنگاوەری بەهێز بوو كە ڕەوشە ئازاردانو گرتنە نهێنییەكانو پیلانو دەسیسەدانانی باش دەزانی, دوای ئەوەی تەمەنی لاویەتی خۆیی بەهەموو جۆرەكانی گەندەڵی بردەسەر , پلەو پایە پەرستی ڕایكێشایە ناو بواری سیاسەتەوە لە پێشدا بە پلەی "كستۆر"و "ئەدیل" دامەزراو لە ساڵی 68ی پێش زایین بەپلەی "پڕتۆر" هەڵبژێردراو پاشان ناونیشانیی "پڕتۆری"لە ئەفریقای پڕبەرەكەت دا بەدەستهێناو هەرلەوێ دەستی كرد بەتاڵانو ڕاووڕووتی سەروەتو سامانی خەڵكیو سامانێكی یەكجار زۆری كۆكردەوە, تا ئەوجێیەی خەڵكانی ئەفریقا دژ بەو شكاتیانكردو رشێگەیان پێنەدا كە لەساڵانی 65و66ی پێش زایین لەهەڵبژاردنەكانی "كۆنسوڵا"بەشداری بكات. پاش ئەوەی لەدادگادا بێتاوان دەرچوو. لەساڵی 64ی پێش زایین لە هەڵبژاردنەكاندا بەشداری كردو ڕووبەڕووی شكست بووەوە, ئیدی بۆی دەركەوت كە لەڕێگای یاساییو ڕەواوە ناتوانێت لەكاری سیاسەتدا سەركەوتن بەدەست بێنێت. پلەو پایەپەرستی هانیدا كە پەنا بۆ دواهەمین چەك واتە زەبروزۆر  ببات‌و پیلانێكی گەورەی دانا بەبەڵێنی درۆو هەڵفریوێنەر چەند هاوكارو هاوڕێیەكی بۆخۆی پێكەوەناو تاقمێك لە غوڵامو دەستوپێوەندو لاوانو سەربازانی هێنایە ناو ریزەكانی

خۆیەوە, تەنانەت توانی یەکێك لە هاوکارەکانی "سیلا"؛ پاڵەوانی بەناوبانگی ئەوسەردەمە بەناوی "مانلیۆس" بکات بەهاوڕێی خۆیو لەدەربەندی "ئاترۆری"کەوتە کۆکردنەوەی هێز, وە بە تەلیسمو قڕوفێڵو بەڵێنی پارە هێزێکی گەورەی پێکەوەنا.

نەخشەی پیلان گێڕەکان ئەوەبوو لە ڕۆژێکی دیاریکراودا لە شوێنە جیاجیاکانی شاردا ئاگر بکەنەوەو هەندێ لە ئاژاوەگێڕەکانی هاوکاریان کە لەناو شاردا بوون خۆپیشاندان بکەنو ڕاپەڕنو لەهەمان کاتەدا ئەوهێزانەی کە لەدەرەوەی شاربوون بێنە ناو شارو بەمشێوەیە کاتلینا دەسەڵاتی وڵات بگرێتە دەست.

کاتلینا کە پیاوێکی دەوڵەمەندو "خانەدان بوو" بەڵێنی بەدەستو پێوەندەکانیو بەخەڵکانی چینی هەژار دەدا کە لەپاش سەرکەوتنی حکومەتێکی دیموکراتی و جەماوەری دادەمەزرێنێت.

شیشرۆن لەم مەسەلانە ئاگاداربوو, هەروەها شانسیش بە هانایەوە هاتو کەسێك بەناوی "فۆلۆیا" کە ڕازداری یەکێك لە هاوکارە نزیکەکانی کاتلینا بوو بە ناوی "ك. کۆریۆس" هەواڵو پیلانەکانی بۆ دەگێڕایەوە, هەرلەم ڕوانگەیەوە شیشرۆن داوای لە ئەنجومەنی پیران کرد دەسەڵاتی دیکتاتۆری بگرنەبەر.

لەپاش بەدەستهێنانی دەسەڵاتی دیکتاتۆری ئیتر دەیتوانی هەر بڕیارێك بداو دەیتوانی کاتلینا بگرێتو لەسێدارەی بدات, بەڵام شیشرۆن سیاسەتمەدارێکی پیشەییو پلەو پایە پەرست نەبوو کەتەنها بیر لە بەرژەوەندی خۆیو پلەو پایەکەی بکاتەوە, ئەو باوەڕی بەهێزی نەپساوەی گەل هەبوو, لەتوانای ڕای گشتی ئاگاداربوو, دەیزانی تەنها هەڵەیەك دەشێ سوكو بەدناوی بکات, گەرچی لەبەدناوی نەدەترساو تەنانەت لەو باوەڕەدا بوو کە بەدناوبوون لە





پێناوی خزمەت بەگەلو نیشتمان گەورەترین شانازیە بەڵام خۆشی و ئاشتی گەلو کۆمەڵگای ڕۆم لەدیدی ئەوەوە لەهەموو شتێك بەنرخ تربوو.

هاوڕێکانی شیشرۆن پێیاندادەگرت لەسەرئەوەی کەدەبێت بەپەلە سەبارەت بە کاتلینا بڕیارێکی توند دەربکرێت بەڵام شیشرۆن لەبەرامبەر ئەواندا خۆڕاگر بوو و دەیزانی کە کاتلینا تەلیسمی لەکۆمەڵە کەسێك کردوەو ئەگەر ئەو ئەم پیلانە پوچەڵنەکاتەوە و تەنها کاتلینا لەسێدارە بدات ئەوا لایەنگرەکانی لەداهاتوودا لە کاتلینا بتێك دروست دەکەنو بەمجۆرە شەڕی ناوخۆو وڵات ئەخاتە مەترسییەوە. لەلایەکی ترەوە بێدەنگیو گوێنەدانی بەو پیلانە لەوە دەرچوو بەنرخی ویرانی ڕۆم تەواو بێت, ئالێرەوە بوو کە سودی لەتوانای زمانپاراوی دەربڕینی خۆی وەرگرتو لە کۆبوونەوەی پڕ خرۆشی هەشتی نۆڤەمبەردا یەکەم وتاری خۆی پێشکەش کرد. لەم کۆبوونەوەیەدا کاتلیناش بەشداری کرد. شیشرۆن بەووتارە بەهێزەی بەشێوەیەك ئەنجومەنی پیران و تەنانەت کاتلیناشی خستە ژێرکاریگەرییەوە کە وەك ئەوە وابوو "هێزێکی سەربازی" لەتەنگاوتەنگی گەمارۆیەك لە هێرشی دوژمن غافڵگیر کرابێت. شیشرۆن توانای بەرگریکردنی لە کاتلیناو هاوڕێکانی سەندەوە, ئەم وتارە لە ڕووی هونەری وتاربێژییەوە لەشاکارە بێوێنەکان دێتە ئەژمار. شیشرۆن لەپاش ئەوەی هێرشە ڕاستەوخۆکانی ئاراستەی کاتلینا کرد ئەوی لەبەرچاوی "پیران– سەناتۆرەکان"دا سووککرد, چیرۆکی پیلان و ئەوچاوپێکەوتنە نهێنییانەی کە لەماڵی سەناتۆر (لەکادا) کرابوو بۆ ئامادەبووانی گێڕایەوە. وتارەکەی شیشرۆن کاتلیناو هاوڕێکانی ناچارکرد شکست قبوڵبکەن, شیشرۆن

لەقسەکانیدا تائەوشوێنە ڕۆشت وتی: کاتلینا تا ئەوکاتەی تەنها کەسێك داکۆکی لەتۆ بکات تۆ دەبێت زیندووبمێنیتەوە.

کاتلینا بەوهەموو دەسەلاتو هاوڕێیانەشەوە کە هەیبوو لە ئەنجامی وتارەکەی شیشرۆن دا دووچاری شلەژانو دڵەڕاوکێ بوو لەبەرئەوەی نەك بگیرێتو بەندبکرێت, شەوەکەی ڕۆمای بەجێهێشتو هەلاتو ڕێگای "ئاترۆری" گرتە بەر, بەلام هەموو هاوڕێکانی لە تەکیا نەڕۆیشتن, لەوکاتەدا واتەوات لەڕۆمادا دەستیپێکردو, خەڵکی لەڕوودانی شەڕی ماڵەومال دەترسان, وە شیشرۆنیان بەوە تاوانبار دەکرد کە لەئەنجامدانی ئەرکەکەیدا کەمتەرخەمی کردووە و ناڕەزاییان دەردەبڕی کە بۆچی "کۆنسول" کاتلینای بەتوندی سزا نەداوە؟

شیشرۆن هەڵکشانو داکشانی ڕای گشتی بەباشی دەناسیو دەیزانی ڕای گشتی هەستیارو ناسکەو زوودەڕەنجێت وە کەسێك کە ڕێزو نرخ بۆ ڕای گشتی دادەنێت دەبێ خۆڕاگری و لێبوردن بەکاری خۆی بزانێت. پاشان بۆ ئارامکردنەوەی بیروڕاکانی و پاساودانەوەی کارەکانی وتاری دووەمی دژ بە کاتلینا بە ئامادەبوونی خەڵکی بەگشتی لە گۆڕەپانی شاردا, پێشکەشکرد.

بەلام دارودەستەو لایەنگرانی کاتلینا هێشتا بەدوای ڕێگاچارەیەکدا دەگەڕان تا ئاکامێك لەوکارەیان بەدەستبهێنن. "لانتلۆس" کەیەکێك بوو لە هاوکارە نزیکەکانی کاتلینا توانی لەگەڵ "نوێنەرانی گلوائالوبرۆژ" کە بۆ سکالاو شکاتی خەڵك هاتبوون بۆ ڕۆما خۆی نزیك بکاتەوەو بانگهێشتی کردن بۆ هاوکاریکردن وە لەم ڕێگەیەوە خەریك بوو سەرکەوتنی بەدەست دەهێنا. بەلام نوێنەرانی ناوبراو بابەتەکەیان بە "فابیۆس سانکا" کە لەباوەڕپێکراوەکانی



"گول" بوو, ڕاگەیاندو ئەویش لەمەترسی جێبەجێکردنی ئەوکارە ئاگاداری کردنەوەو پێشنیاری کرد کە بابەتەکە بە "کۆنسۆل"ڕابگەیەننو, خۆشی شێوەی پەیوەندیکردنی ئەوانی لەتەك کونسۆلدا فەراهەمکرد.

شیشرۆن ئەوانی ڕێنمایی کرد کە بڕن بە هاوڕێی تا نەخشەکانی پیلانگێران بزاننو "لانتلۆس" ناچار بکەن نامە گەلێك بەناوی "گەلو پیران"ی "ئالوبرۆژ"بنوسێتو داوای هاوکارییان لێبکاو هەروەها نامەیەك لە لانتلۆس وەربگرن بەمەبەستی ناساندنیان بە کاتلیناو لەگەڵ یەکێك لە کەسە نزیکەکانیاندا بڕۆن بۆلای کاتلینا, نوینەرانی ئالوبرۆژ لە ئەنجامی ئەو پێشنیارانەی شیشرۆندا سەرکەوتنیان بەدەست هێناو نامەکەیان لەلانتلۆس وەرگرت. وبەمجۆرە شیشرۆن بەهاوکاری و ئاگاداری ئەوان بۆسەیەکی لەسەر پردی "میلۆیۆس"داناو لەشەوی سیٚلەسەردووی دیسامبەر کاتێك کە ئەو پیلانگێرانە دەهاتن بەرەو ئاترۆری, دەستگیرکران. "ڤۆلتۆریۆس"یش کە لەگەڵ ئەواندا بوو نامەی لانتلۆسی پێبوو بۆ کاتلینا کەوتە بۆسەکەوە. کاتێك ئەم ئامادەییانە کە بەڵگەگەلێکی تەواو بوون بۆ پیلانگێری, کەوتنە دەست شیشرۆن, یەکسەر "لانتلۆس"و "ستگۆس"و"ساتیلیۆس"و "کابینۆس"و باقی سەرکردەکانی پیلانەکە لە ڕۆما بوون دەستگیر کران. بەندکراوەکانیان برد بۆ "پەرستگای کەنکۆرد"و ژمارەیەك لە نوێنەرانی پیران(سەناتۆرەکان) ئامادەبوون؛ پاشانیش لەتەك هەر یەکێکیاندا بەجیاجیا لێکۆڵینەوە دەکرا, لەکۆتاییدا پاش پرسیارو لێکۆڵینەوەی توندو دوورودرێژ بەندکراوەکان دانیاننا بەهەموو شتێکدا . لێکۆڵینەوە لەسەرو وەختی تەواوبووندا بوو کۆبوونەوەی ڕەسمی (سەنا) دەستیپێکرد.





دانپیانانەکانی دەسگیرکراوەکان بە (سەنا) ڕاگەیەندراو ئەنجومەنی پیرانیش بەیەك دەنگ ڕایان لەسەر بەمەحکومکردنی پیلانەکە داو بڕیاریاندا تا کۆتایی دادگایکردنی بەندکراوەکان دەبێت هەریەکێکیان بەکەسێکی باوەڕ پێکراو بسپێردرێت‌و لێپرسراویەتی بەندکراوەکە بەوکەسە بسپێردرێ.

هەروەها لەلایەن پیرانەوە فەرمانی سازدانی جەژن‌و ئاهەنگی سوپاس گوزاری دەرچوو, بەوبۆنەیەشەوە سوپاس و پیزانینی پیران سەبارەت بەو کارە پڕ بایەخەی (کۆنسوڵ) ڕاگەیەندرا کە (توانیبووی شاری ڕۆم لەمەترسی ئاگرتێبەردان خەڵکی ڕۆم لەنەهامەتی ئاژاوەو کوشتارو ڕاوڕووت‌و مەترسییەکانی جەنگ ڕزگار بکات).

هەردوای ئەوەی کۆبونەوەکە کۆتایی هات شیشرۆن بەپەلە بەرەو گۆڕەپانی شار ڕۆیشت تا خەڵکی شاری ڕۆما لەئەنجامی ئەوکارانەی کە پێی هەستابوو ئاگادار بکات هەرلەوکاتەشدا "وتاری سێهەمی دژ بە کاتلینا" پێشکەشکرد, ئیدی شیشرۆن بە کۆمەکی (وتارە بەهێزەکان) توانیبووی خیانەت‌و پلانە نەگریسەکەی کاتلینا ئاشکرا بکات, بەشێوەیەك کە هیچ کەس گومانی لەخیانەتی کاتلینا نەبوو,وڕای گشتیشبەقازانجی شیشرۆن گۆڕابوو.

ڕۆژی چوارەمی دیسەمبەر ئەنجومەنی پیران دانیشتنێکی سازداو بۆئەو کەسانەش کە پیلانەکەیان ئاشکراکردبوو "پاداشت‌و دیاری گونجاو"یان پێدرا. لەوهەلومەرجەدا شیشرۆن دەیتوانی چ ڕۆڵێك لەئەستۆ بگرێ؟ دەیتوانی چی بکات؟ دیارە دەیتوانی لەودەسەڵاتە دیکتاتۆریەی (ئەنجومەنی پیران کەبۆ ماوەیەکی دیاریکراو) پێیان دابوو سود وەربگرێ‌و پیلانگێڕان لەسێدارە بداتو, بەڵام ئایا ڕای گشتی هەمیشە دەرهەق بەووەفادار دەمێنێتەوە؟ شیشرۆن هێشتا





دەترسا کە نەك ڕای گشتی بگۆڕیۆ دوژمن کاریگەریان لەسەردابنێت. و بۆ دڵنیابوون وای بەباش زانی پەنا بۆ دەسەڵاتی ئەنجومەنی پیران ببات بانگهێشتی نوێنەرانی پیران(سەناتۆرەکان)ی کرد کە بەیانی ئەورۆژە واتا "ڕۆی 5ی دیسامبەر" لە پەرستگای کەنکۆرد کۆببنەوە. لەپاش کۆبوونەوەی پیران, شیشرۆن کورتە وتارێکی وەك پێشەکییەك خوێندەوەو, داوای لە نوێنەرانی پیران (سەناتۆرەکان)کرد کە دەربارەی تاوان‌و سزای پیلانگێڕە بەندکراوەکان ڕاوبۆچوونی خۆیان دەربڕن.

"میلانۆس و کۆنسوڵەرەکان" توندترین سزا واتا لە سێدارەدانیان بۆ تاوان باران دانا, بەڵام "سزار" لەوباوەڕەدابوو کە دەبێت پیلانگێڕان بە "زیندانی هەتایی" لەگەل کاری تاقەت پڕوکێنەر سزا بدرێن‌و دەست بەسەر موڵك‌و داراییەکانیاندا بگیرێت‌و هەرکام لەوان بۆ شارێك دوربخرێنەوەو فەرمانی یاساییان بەسەرا بسەپێنرێت.

وتارەکەی سزار لەودانیشتنەدا هێندە کاریگەربوو کە ئیتر ئومێدێك نەمابوو لە ئەنجامێکی تر بەدەست بێت تا بۆ یەکێك لەو دووپێشنیارە کۆی دەنگ‌و ڕا بەدەست بێت‌و بسەپێنرێت.

شیشرۆن, لەدڵەوە پێی خۆشبوو پێشنیارەکەی "سلانۆس"جێبەجێ بکرێت خۆ ئەگەر نەکرا لانیکەم بیروڕای سزار جێبەجێ بکرێت تا هەرچۆنێك بێت چارەنوسی تەواوی ئەوتاوانبارانە ڕوون بکرێتەوە , بڕیاریدا وتاری چوارەمی خۆیی دژ بە کاتلینا پێشکەش بکات. لەووتارەدا هیچ ئەنجامێکی وەرنەگرت.

لەوکاتەدابوو کە "تریبۆس نیرۆن" پێشنیاری کرد تاوانبارەکان لەزینداندا بمێننەوە تا پاش لابردنی دالغەی کاتلینا سەبارەت بە تۆمەتەکانیان, لەدادگای ئاسایدا دادگایی بکرێن.

بۆ جێبەجێکردنی ئەم پێشنیارە زەمینەیەکی باش ئامادەبوو "کاتێن" لەوتارێکدا بیروڕای خۆیی لە سەرفەرمانی لەسێدارەدانی تاوانبارەکان دەربڕی, قسەکانی کاتێن ئەوەندە کاریگەر بوو کە پێشنیارەکەی بەکۆی نزیکەیی هەموو دەنگەکان پەسەندکراو فەرمانی لەسێدارەدانی هەموو تاوانباران دەرکراو "کۆنسول" کۆتایی کۆبوونەوەکەی ڕاگەیاندو لەگەڵ چەند کەسێك لە نوێنەرانی پیران (سەناتۆرەکان)بەپەلە ڕۆیشت بۆ ئەوماڵانەی تاوانبارەکانی لێبوون, هەموویانیان کۆکردنەوەو بردیانن بۆ زیندانی "مامرتین"و خستیاننە (تۆلیانۆم)ەوەو لەوێ جەلادەکان چاوەڕوان بوونو کۆتاییان بەژیانی ئەو تاوانبارانە هێنا.

کاتێك شیشرۆن لەگەڵ پاسەوانو قەرەوڵەکاندا بەر لە "سەناتۆرەکان" لەزیندانەکە هاتە دەرەوە, خەڵکێکی زۆر لەسەرشەقامەکانی شار کۆبووبوونەوە بەسەرسامیو بێدەنگی سەیریان دەکرد. شیشرۆن کاتێ گەیشتە لای خەڵکەکە دەستی بەرزکردەوەو هاواریکرد:– "لەسێدارەدران" بەبیستنی ئەو قسەیە خۆشی و سوپاس گوزاری خەڵك لەتاریکی شەودا "کە تازە باڵی ڕەشی بەسەرشاردا دەکێشا" بەرزبووەوەو یەکێ لە ئامادەبووانی ناوخەڵکەکە ڕووی کردە شیشرۆنو بەدەنگی بەرز هاواریکرد "باوکی گەل", لەکاتێکدا هەموو خەڵکەکە بە دەنگی بەرز ئەو قسەیەیان دووپات دەکردەوە, لەناو ڕووناکی مەشخەڵەکانو بەهاواری شادمانی شیشرۆنیان تا بەردەمی ماڵەکەی ڕەوانەکرد. ئەم نازناوە گەورەیە کە لەدەمی کەسێکی نەناسەوەو لەساتوکاتێکی پڕ لەخۆشیو خرۆشێنەردا هاتە دەرەوە سەرنجی هەموانی ڕاکێشا.





"کاتین"ئەمەی بۆ گەل پێشنیارکردو "کاتالۆس"یش لەکۆبوونەوەی "ئەنجومەنی پیران"دا خستیە ڕوو پاش چەند ڕۆژێك لەلایەن گەلو ئەنجومەنی پیرانەوە ئەم ناونیشانە شکۆدارە بەڕەسمی درا بە "وتاربێژی بەناوبانگ– شیشرۆن". لەگەڵ ئەوەشدا هێشتا خودی کاتلینا مابوو کە لەگەڵ "ماتلیۆس"لە "ئاترۆری" خەریکی کۆکردنەوەو تۆکمەکردنی هیزبوون.

هەر کە هەواڵی لەسێدارەدانی هاوڕێو هاوکارەکانی کاتلینا کە لەشاری ڕۆمادا لەنێو خەڵكو سوپاکەی کاتلینادا بڵاوبووەوە بەشێکی زۆر لەهاوڕێو هاوکارو سەربازەکانی وازیان هێناو بلاوەیان لێکرد.

کاتلینا لەگەڵ پاشماوەی هێزەکەیدا بەرەو "پستۆریا"کەوتەڕێو لەوێوە بەرەو سەرزەمینی "گول ترانس ئالپین" ڕۆیشت بەڵام لەرێگا لەنێوان دو هێزی گەورەدا گەمارۆ درا لەبەشە شاخاویەکەی ئەوناوچەیە "کسۆس مەتلۆس سیلێر" ڕێگایەکی لیگرتو لەبەشە پێدەشتەکانەوە "کۆنسولی دووەم– گایۆس ئانینیۆس" بەهێزێکی گەورەوە بەدوایەوە بوو. کاتلینا بڕیاری دا هێرش بکاتە سەردوا تاقمیان تا ڕێگایەك بۆ وەدەربازبوون بکاتەوە, "ئانینیۆس" کە نەخۆش بوو فەرماندەیی هێزەکەی دا بە جێگرەکەی واتا "مارکۆس پەریۆس" کە سەربازێکی ئازاو فەرماندەیەکی بەتواناو شایستە بوو.

لە ناوچەی "سپتۆریا" (کە ئێستا بەناوی پستۆیا ناودەبرێت) لە سی کیلۆمەتری "فلۆرنتیا" لەڕۆژی 5ی یەنایەری ساڵی 63ی پێش زایین شەڕێکی توندو دژوار لەنێوان هەردوو گروپەکەدا بەرپابوو, کاتلیناو تاقمێك لە هاوڕێکانی لەپاش شەڕێکی توندو خوێناویو دەرخستنی ئازایەتیەکی لەڕادەبەدەر کوژران.

# ژیانی شیشرۆن

شیشرۆن "مارکۆس تیلیۆس شیشرۆ"ڕۆژی سێهەمی ژانوییەی ساڵی 106ی پێش زایین لە شاری ئاپرینۆم" کە ئێستا بەناوی ئاپرینۆ ناودەبریٚ"و کە دەکەوێتە بەشی رۆژهەڵاتی "لاسیۆمی دێرین"ەوە لەدایك بوو بنەماڵەی شیشرۆن لە چینی خانەدانەکان بوون‌و هیچ کام لە ئەندامی بنەماڵەکەیان لەپێش ئەودا بەپلەی "دادوەری" نەگەیشتبوون. لەسەردەمی لاویەتیدا عەشقێکی لەڕادەبەدەری بۆ کاری "پارێزەری" هەبوو لە شانزدە ساڵیدا هونەری وتارو وتاربێژی فێربوو. لە 22 ساڵیدا کتێبێکی لە هونەری ڕەوانبێژی دا نوسی‌و فێری فەلسەفەو مافناسیش بوو لە ساڵی 81ی پێش زاییندا لە دادگایکردنی "کینکتیۆس"دا بەشدار بوو و بەرگریشی لێکرد. لەرۆژگاری دیکتاتۆری "سیلا"دا یەکێك لە نزیکەکانی بەناوی "گریزکنۆس"دەیویست سەروەت‌و سامانی "ڕیسۆس" ناوێك بۆخۆی زەوت بکات‌و دەستی بەسەردا بگرێت, بۆ جیبەجێکردنی ئەم مەبەستەش ئەوی کوشت بەمەشەوە نەوەستایەوەو کوڕەکەی ڕسیمۆسی بەکوشتنی باوکی تاوانبار کردو ڕایکێشایە بەرمیٚزی دادگا, لەم دادگاییەدا شیشرۆن بوو بە پارێزەری کوڕەکەی رسیۆس‌و بێتاوانی ئەوی سەلماندو ئازادی کردو بەمکارەشی ناوبانگی‌دەرکرد. پاشان بۆ بەدەستهێنانی زانیاری زیاتر گەشتێکی بۆ یۆنان‌و دوورگەکانی مەدیترانەو ئاسیای بچووك کرد,





(لەساڵەکانی 77و79ی پێش زایین). لەگەڕانەوەیدا زەماوەندی لەتەك (ترنتیا)کرد. لەساڵی 75ی پێشزایین بوو بە خەزنەداری شاری "سیسیل" لەویٚ بەشێوەیەك سەرنجی چینی ناکام‌و هەژاری بۆ خۆی ڕاکێشا کە کاتێك دانیشتوانی سیسیل دژ بە زوڵم‌و ستەمی "ڤێرس" فەرمانڕەوای زۆردار سکاڵایان پێشکەشکردو شکاتیانکرد, لەوچاکتر پارێزەرێکیان بۆ بەدەستهێنانەوەی مافەکانیان پەیدا نەکرد, "ئەندامانی ئەنجومەنی پیران" هەوڵیاندەدا دادگاییکردنی ڤێرس دوابخرێت لە دەست دادپەروەری ڕزگاری بکەن, بەڵام شیشرۆن بەسەر هەموو کێشەکاندا سەرکەوت‌و, لەمانگی ئوتی ساڵی 70ی پێشزایین دادگایکردنی (ڤێرس) دەستپێکرد. لەم دادگاییەدا قسەی شاهیدەکان ئەوەندە شەرمهێنەر بوو کە ڤێرس پێشگوێگرتن لە قسەکانی شیشرۆن‌و دەرکردنی بڕیارەکە لەدادگای ڕۆما چووە دەرەوە. لەدادگادا دەقی بابەتەکانی بڵاوکردەوەو ئەم نووسراوانەش بە ناوی "ڤەرین"ەوە ناوبانگی دەرکرد.

یەکیٚ لەبەناوبانگترین بەشەکانی وتاری ناوبراو لەوێدایە کە شیشرۆن ڕای دەگەیەنێت چۆن ڤێرس بێباکانە یەکێك لەدانیشتوانی ڕۆمای ئەشکەنجەو ئازارداوە.

((لەمەیدانی گشتی "مەسین"دا کەسێکیان داریکاریدەکرد کە لەمافی هاوڵاتیبوون بەهرەمەند بوو. لەو کاتەدا کە ئێش‌و ئازاری زەبری دارکاریەکەی ئەچێشت, هاواری دەکرد "من هاووڵاتی ئێوەم‌و پیاوێکی ڕۆمیم"وایدەزانی بەم قسەیە, بەم چەکە دەتوانێت بەرگری لە ئەشکەنجەی زۆرداران بکات‌و خۆی ڕزگار بکات, هاوارەکانی بەهیچ جێگایەك نەگەیشت‌و دارکاریکردنیشیان ڕانەگرت, بەپێچەوانەوە لەهەمان کاتدا هەزاران جار دەنگی هات‌وهاواری کە دەیگوت:– "من

ڕۆمیم" دەزرنگایەوە خاچێکیان هێناو ئەوچارەرەشەیان لەخاچ دا, دڵڕەقی (ڤێرس)گەیشتە ئەو ڕادەیەی خاچەکەی بەرامبەر "ئیتالیا" ڕاگرت تا بەئاشکرا ئەو بەدبەختە ببینن کە لەژێر ئەشکەنجەدا دەمرد لەو ناوچە ئازادەدا کە سەرزەمینی کۆیلەیی‌و بەندەیی بە کەناڵێکی تەسک لەیەك جیا دەکردەوە, (مەبەستی وتەبێژ کەناڵی "مسین"ە کە سەرزەمینی ئیتالیای لە دوورگەی سیسیل جیادەکردەوە) وبزانێت ئیتالیا یەکێك لەڕۆڵەکانی دەبینیٚ کە بەکەرەسەی ئازارو ئەشکەنجە بەستراوەتەوەو تەحەمولی سزایەك دەکات کە تایبەتە بە کۆیلەو غولامەکان.))

شیشرۆن لەساڵی 69ی پێشزایین بەپلەی "ئادیل"و لەساڵی 66ی پێشزایین بە پلەی "پەڕتور" هەڵبژێردرا, لەسەردەمێکدا کە کۆنسول بوو پیلانەکەی کاتیلینای پوچەڵکردەوەو لەساڵی 58ی پێشزایین دوورخرایەوە, لەساڵەکانی 50و 51ی پێشزایین پلەی "پروکۆنسول"ی لە سیسیل پێدراو پاشان چوو بۆ "دێرئاشیۆم بۆ لای پەمپە " وپاش شکستو مردنی پەمپە (20ی ژوێنی ساڵی 48ی پێش زاییندا)و ساڵێك دوای ئەوە "سزار" ڕێی پێداو گەڕایەوە بۆ "ڕۆما". لەساڵی 46ی پێشزایین لە ترنتیای خێزانی جیابۆوەو شیشرۆن لەو ژنەی کوڕێکی بوو بەناوی "مارکۆس" لەساڵی 64ی پێش زاییندا وە لەساڵی 76ی پێش زایینیش کچێکی لێی بوو بەناوی "تولیا". پاش جیابوونەوەی لە ترنتیا شیشرۆن "پۆبلیلیا"ی خوازبێنی کردو بوو بەهاوسەری. تولیای کچی لەساڵی 45ی پێشزاییندا مرد.





شیشرۆن پاش ناکۆکییەك لەگەڵ "ئانتوان" دا لەرۆژی حەوتەمو بەپێی گێڕانەوەیەکی دی لە رۆژی 8ی دیسامبەری ساڵی 43ی پێشزایین لەماڵەکەی خۆیدا کوژرا.

شیشرۆن لە ڕشتەگەلی جۆراوجۆردا زانیاری بەدەستهیناو گەلەك چالاکی ئەنجامدا لەکاتێکدا کە سیاسەتمەداربوو بە "خەتیب‌و وتاربێژ"ێکی سیاسیش دادەنراو لەهەمان کاتیشدا "فەیلەسوف و مێژوونوس‌و ئەدیب"یش بوو, شیشرۆن ئەگەرچی "لەسەرنگون کردنی کاتلینادا خزمەتێکی گەورەی ڕۆمای کرد", بەڵام سیاسەتمەدارێکی بەرجەستەنەبوو, ئەو بۆ دروستکردنی پارتێکی میانڕەو کە لەنێوان خانەدان‌و خەڵکی ڕەمەکیدا بێت هەوڵێکی زۆریدا, بەڵام هیچ ئەنجامێکی دەستنەکەوت, هۆی سەرنەکەوتنیشی زیاتر دەگەڕایەوە بۆ بارودۆخی وڵات‌و هەروەها لاوازی‌و ڕاڕایی لەڕادەبەدەری خۆی, شیشرۆن لە ڕاستگۆیی‌و متمانەی تەواو بەهرەمەند بوو.

شیشرۆن 110 وتاری پێشکەشکردووە کە 33وتاری دیارنییەو لە 20 وتاری دیکەی ئەمڕۆ تەنها چەند بەشێکی ماوەو 57وتاری دیکەی ئەو بەتەواوی ماوە. بێگومان لەرۆمای دێریندا دەبێت شیشرۆن بەگەورەترین "داکۆکیکار" بناسرێت.

چەند شیعرێکیش لە شیشرۆن بەجێماوە کە نرخێکی ئەوتۆیان نییە- بێگومان گرنگی‌و نرخی شیشرۆن لە مێژودا بەهۆی ئەووتارانەوەیە کە ماونەتەوەو بەگەورەترین "خەتیب‌و وتاربێژ"ی ڕۆما دەناسرێت, دەکریٚ ئەو لەڕیزی گەورەترین خەتیب‌و وتاربێژەکانی یۆناندا وەك (دیمستن) دابنرێت.

# وتاری یەکەم

## دژبە "کاتلینا"

ئەم وتارە رۆژی هەشتی نۆڤەمبەر لە ئەنجومەنی پیران  پێشکەشکراوە

کاتلینا, تاکەی سەبرو ئارامی ئێمە دەبێتە هۆی بێپەروایی تۆ؟ تاکەی ئێمە دەبێ ببینە گەمەی ستەمو دەستدرێژیەکانی تۆ؟ لەدواجاردا بێپەروایت بەکوێ دەگا؟ نە پاسەوانەکان کە بەشەو لەچیای "پالاتۆن[1]" کێشك دەگرن, نە ئەوهێزانەی لەناوشاردا بڵاوبوونەتەوە, نەخۆپیشاندانی ئەم خەڵکە نەجیبو رەسەنەو نەئەم شوێنە توندو تۆڵە[2] کۆبوونەوەکانی "ئەنجومەنی پیران"ی تیا ئەنجام

---

(1)شـــوێنێکی بـــەرزە لەناوەنـــدی شـــاری "رۆمـــا"دا کـــە 45 مـــەتر بەرزاییەکەیـــەتی و لـــەنێوان لاوانـــتین و لۆکـــائیلیۆس و لیســـگیلیین دایـــەو تاســەردەمی ئیمپراتــۆری لەقەدپاڵەکانیــدا ئەشــکەوتێك دەبینــرا کــە بــەپێی روایەتــە ئەفســانەییەکان رۆمیــەکان لــەوباوەڕەدا بــوون گــورگێکی مێچــکەکە (رۆمۆلۆس و رۆمۆس)ی دامەزرێنەرانی بناغەی رۆما لەمنداڵییاندا بەشیری خۆی پەروەردەی کردوون, لەوئەشکەوتەدا ژیاوە.

(2) شیشـــرۆن "ســـەناتۆرەکان"ی بانگێشـــتکردبوو کـــە لـــە پەرســـتگای ژۆپیتـــەری ئەســـتاتۆر کۆببنـــەوە. ئـــەم پەرســـتگایە لەقـــەدپاڵی بـــاکوری "پـــالاتۆن"دابـــوو. وە لـــەنزیك ئـــەوێ "جـــادەی پـــیرۆز" تێدەپـــەڕی و مـــاڵی شیشـــرۆن دراوســـێی ئەوپەرســـتگایەبوو, شیشـــرۆن هێزێکـــی زۆری بـــۆ پاراســـتنی پەرســـتگاکەو ماڵەکـــەی خـــۆی لەوێـــدا کۆکردبـــووەوە, بـــەپێی یاساکانی رۆما "کۆنسول" ڕێ پێدراو و سەرپشکبوو لەوەی دانیشتنەکانی








"کۆنگرەی پیران" بەئارەزووی خۆی لەیەکێك لەپەرستگاکاندا یان ئەو شوێنانەی کە هەر بۆ مەبەستی کۆبوونەوە دروستکرابوون دابینبکات.

(3)"تیبریۆس و کایۆس گراگۆس"کوڕی "سمپرۆکیۆس گراگۆس"و "کۆرنێلی" کچی سیپۆنی ئەفریقی بوون کە هەردووکیان پلەی "تریبۆن"یان هەبوو لە گیانبازانی گەل ئەژماردەکران, هەردووکیان بەدەستی خانەدانەکان کوژران. براگەورەکەیان لەساڵی 133ی پێشزایین لەبەرامبەر پێشێلکاریەکانی خانەدانەکاندا سەرکەوتنی بەدەستهێناو توانی یاسای دابەشکردنی زەویەدەوڵەتییەکان دابمەزرێنێ. بەپێی یاسا, زەوییەکانی دەوڵەت لە نێوان خەڵکانێکی هەژاردا دابەشکران, لەکۆتایی ئەم قۆناغەدا دیسانەوە لە هەڵبژاردنەکاندا بەشداریکرد بەڵام لەرۆژی ڕاپرسی یەکەدا لە نێوان لایەنگران و نەیارەکانیدا شەڕو پێکدادان دەستی پێکرد, تیبریۆس کە لەنێوانی دوو لایەنی شەڕەکەدا وەستابوو دەستی خستە سەرسەری و دەیویست بە لایەنگرانی خۆی بڵێت کە نەیارەکانم دەیانەوێ بمکوژن, بەڵام نەیارەکانی لەمکارەی تیبریۆس دەسبەجێ سودیان وەرگرت و بەئەندامانی پیرانیان ڕاگەیاند کە تیبریۆس لە خەیاڵ و ئارەزووی "تاجی پاشایەتیدایە". لەم کاتەدا سیپۆن نازیکا کە یەکێك بوو لە سەناتۆرەکان داوای لە کۆنسوڵی ئەوکاتە کرد کە هەستێت بە ڕزگارکردنی کۆمار. ئاسکائودلای کۆنسوڵ دەڵێت: بەهیچ شێوەیەك ئامادەنییە کە بەبێ دادگاییکردن خوێنی هیچ کەسێکی ڕۆما بڕێژرێت. لەگەڵ ئەمەشدا نازیکا لە پێشاوپێشی غوڵام و دەست و پێوەندەکانیەوە کەبۆ مەبەستەکەی خۆی لە پێشدا ئامادەی کردبوو پەلاماری "تیبرۆس"یان دا. لەم ڕووداوەدا تیبریوس و سێسەد کەس لە هەڤاڵانی کوژران و لاشەکانیان فڕێدرانە ڕووباری "تیبر"ەوە.

"کایۆس گراگۆس"ی برا بچوکیش لە ساڵی 126ی پێشزایین لە "ساردنی"بەپلەی کۆنسولی گەیشت و لەساڵی 122و 123ی پێشزایین بەپلەی "تریبۆن" گەیشت. ئەو بیروباوەڕو ڕێبازی براگەورەکەیی بۆ خزمەتکردنی خەڵکی بەتوندی گرتەبەرو خۆشەویستییەکی لەڕادەبەدەری لەناو کۆمەڵانی خەڵکدا بۆخۆی بەدەستهێنا. نەیارەکانی بۆ ڕێگرتن لەجێبەجێکردنی مەبەستەکانی و بەدەستهێنانی پلەکەیدا دەستیان دایە فرۆفێڵ بۆئەوەی خەڵکانی عەوام کە بایەخیان بە تێڕوانینەکانی گراگۆس دەدا, هەڵفریوێنن و بیانخەڵەتێنن. یەکێك لە هاوکارەکانی بەناوی "لیویۆس درۆسۆس"یان لەبەرامبەر ئەودا دانا. لەبەرامبەر هەرپێشنیارێکدا کە "کایۆس گراگۆس" بەقازانجی هەموان پێشکەشی دەکرد" لیویۆس درۆسۆس" هەنگاوێکی زیاتری دەناو پێشنیارێکی پێشکەش دەکرد کە لە ڕواڵەتدا سودی بۆ گەل زیاتر بوو. لەماوەی حەفتا ڕۆژدا کە کایۆس گراگۆس بەرەو "کارتاژ" ڕۆیشت تاکو زەوییەکان بەسەر شەش هەزار کەس لە خەڵکانی هەژاردا دابەشبکات و لەشوێن وێرانەکانی شاری کارتاژ "کۆچ نشینانێك" ی تازە نیشتەجێ بکات.

نەیارەکانی لە نائامادەیی ئەو سودیان وەرگرت و یەکێك لەدوژمنەکانی بەناوی "ل. ئۆپیمیۆس"یان کرد بە کۆنسول و کاتێك کایۆس لەسەفەر گەڕایەوە ئیدی سەرکەوتنی لەوەرگرتنی پلەی تریبۆن دا بەدەستنەهێنا. نەیارەکانی خەریك بوون بەوەوە ئەویاسایانەی کە بۆ سەرلەنوێ ژیانەوەی کارتاژ دای نابوون هەڵیوەشێننەوە, کایۆس دەیویست بەرگری لەخۆی بکات و لایەنگرانێکی زۆری پەیداکرد. نەیارانی کایۆس و لایەنگرانی بەجۆش و خرۆشێکی لەڕادەبەدەرەوە بەرگرییان لە دیدو بۆچوونەکانی خۆیان دەکرد, شەوێك پێشئەوەی کە بڕیاربوو یاسای ناوبراو بخرێتە ژێر باس و لێکۆڵینەوە, یەکێك لەلایەنگرەکانی ئۆپیمیۆس بەدەستی یەکێك لەلایەنگرەکانی کایۆس کوژرا. کۆنگرەی پیران لەو ئاژاوەیە سودی وەرگرت و دەسەڵاتی دیکتاتۆری دایە کۆنسول و لەلایەن کۆنسولەوە سەربازەکان لە "کاپیتۆل"و زۆربەی شوێنەکانی تری شاردا خرانە حاڵەتی



ئەدرێت, نەئەو نیگاپڕ لەسوکایەتیەی سەناتۆرەکان هیچکامیان کارت تێناکەن, مەگەر نابینیت کە هەموو پیلانەکانی تۆ ئاشکرابووەو دەسیسەکانت لەهەر لایەکەوە گەمارۆ دراون‌و کۆت کراون؟ وا دەزانیت هیچکام لە ئێمە نازانین کەتۆ دویٚشەو وشەوی پێشتر چیتکردووە؟ بۆ کام ماڵ چوویت‌و کام کەسانەت لەگەڵدا بوو و چ پیلانگەلێکت بۆ تەنیوە؟ رۆژگارێکی سەیرە! ئەنجومەنی پیران هەموو شتێکت دەزانن‌و "کۆنسول" دەبینێت دیسانەوە کاتلینا درێژە بە ژیانی خۆی دەدا ئاساییەو دێت بۆ ئەنجومەنی پیران‌و لەشورای کۆماریدا رێی پێئەدەن, ئەودێت‌و لەنێوانماندا ئەو نێچیرەی دەیەوێت لەناوی ببات دەستنیشانی دەکات‌و بەلێهاتوییەوە وادەزانین کە ئەگەر گیانی خۆمان لەژێر زەبری خەنجەرەکەیدا بەسەلامەتی دەرکرد خزمەتێکی گەورەمان بەوڵات کردەوە.

کاتلینا دەبوایە "کۆنسۆڵ" ماوەیەك لەمەوبەر کۆتایی بەژیانی تۆ بهێنایەو سەری تۆی بخستایەتە ژێرئەو تیغەی بۆ ئێمەت

---

ئامادەباشیەوە. لەوجەنگەدا کە لەنێوان هەردوولادا ڕوویدا لایەنگرانی کایۆس پشتییان تێکردو بەناچاری ڕووی کردە دارستانێك و هەر لەودارستانەدا بەدەستی یەکێك لە غوڵامانی باوەڕپێکراوی خۆی کوژرا. ئۆپیمیۆس ڕای گەیاندبوو کە خەڵاتێك بەئەندازەی کێشی کایۆس دەداتە ئەوکەسەی کە بیکوژێت. هەروەك دەگێڕنەوە بکوژەکەی لەپاش کوشتنی مێشکی سەری دەرهێناو پڕی کردبوو لە قوڕقوشم.

فۆلۆیۆس کە یەکێبوو لە هاوکارانی نزیکی کایۆس لەوجەنگەدا کوژراو کوڕە بچووکەکەی کایۆسیش کە تەمەنی هەژدە ساڵ بوو وە بۆ وتووێژ رۆیشتبووە لای ئۆپیمیۆس زیندانی کراو هەر لەبەندیخانە کۆتاییان بە ژیانی ئەویش هێنا.





ئامادەدکردووە. "گراکی یەکەم[] " کاتێك ویستی لەسیستمی بەردەوامی کۆماریدا گۆڕانکارییەکی زیانبەخش دروست کات لەبەرامبەریدا یەکێك لەپیاوە خانەدانەکان کە ناوی" سیپۆنی گەورە" بوو, وەستایەوە. لەگەڵ ئەوەشدا کە دادوەر نەبوو و لەمەسەلە دادوەریەکانیشی نەدەزانی, بە سزای مەرگی گەیاند, ئێستاش کاتلینا کە خۆی ئامادە دەکات تا وڵات بخاتە ناوخوێن‌و ئاگرەوە, بەڵام کۆنسولەکان بە سزای خۆی ناگەیەنن.

من لێرەدا قسە لەسەر "سێرڤیلیۆس ئاهالا[أ] " ناکەم کە کاتێك دڵنیابوو "سپۆریۆس مالیۆس" دەیەوێت گۆڕانکارییەك بەسەر

---

(ا) لەساڵی 100ی پێش زاییندا تریبۆن ل. ئاپۆلیۆس ساتورنیۆس‌و پڕۆتۆرسێرڤیلیۆس گالیبا (پەتۆرەکەکان ئەوکەسانە بوون کە تەنها لە کاروباری "دادوەری"دا بەشدارییان دەکردو بەدادوەری شار دەناسران) بەنهێنی لەگەڵ ماریۆس دا کە بۆ شەشەمین جار بەپلەی کۆنسول گەیشتبوو هاوکاریان کرد لەوەی یاسا گەلێك کە "گراگەکان"بەسوودی خەڵکانی هەژار دایان نابوو و لەپاش ئەوان وەلا خرابوون هێنایاننەوە ئاراوەو لەرۆژی هەڵبژاردندا کە دەبوایە بۆ دەستنیشانکردنی کۆنسوڵ ڕاپرسی بکرایە لەگەڵ گروپێکی زۆر لە هاوکارەکانیان چوونە "مەیدانی موریخ"و لەوێ "مەمیۆس" یان کوشت کە یەکێك بوو لە ڕکابەرە گەورەکانی "سێرڤلیۆس" لەهەڵبژاردنەکاندا. بەهۆی ئەم ڕووداوەوە سەناتۆرەکان کە لەومەیدانە ئامادەبوون دەستیان دایە چەك‌و ماریۆس بەناچاری سەرکردەیی ئەوانی گرتە ئەستۆو هێرشی بردە سەر هاوکارەکانی پێشوی خۆی‌و لەگەڵیاندا کەوتە شەڕ. مەبەستی شیشرۆن لە ناوهێنانی سێرڤیلیۆس ئاماژەیە بۆ ئەوبابەتە کە بەهەموو ئەو ئیمتیازانەوە کە لەڕووی هێزوتوانای

بنەمای کۆماریدا بهێنێت. بۆ ڕزگارکردنی کۆمار بەدەستی خۆی کۆتایی بە ژیانی هێنا. چونکە ئەم قسانە ئیتر کۆن بوون‌و ئەوسەردەمانەش بەسەرچوون کە پیاوانی گەورە هەمووشانازیەکانی خۆیان لەگرەودا دادەنا تا لەگەڵ خائینەکاندا هەروەك پڕمەترسیترین دوژمنانی خۆیان هەڵس‌وکەوت بکەن.

کاتلینا! ئەمڕۆ یەکدەنگی "ئەنجوومەنی پیران" هێزو توانایەکی مەترسیدار لەبەرامبەر تۆدا دەخاتە گەڕو دەسەڵاتێکی گەورەش بەئێمە دەدات, نەمتمانەی شوراکان‌و نەهێزی یاساکان هیچکامیان لەکۆمار نەسەندراونەتەوە, تەنیا ئێمەین بەئاشکراو بیٚ‌پەردە دەڵێین تەنها ئێمەین کۆنسوڵگەلێکی خۆنەپارێز کە ئەرکی خۆمان جێبەجێناکەین.

لە ڕابووردوودا کاتێك ئەنجوومەنی پیران بۆ ڕزگاری وڵات دەسەڵاتی یاساییاندا بە "ئۆپیمیۆس", هێشتا شەوبەسەردا نەهاتبوو کە س. گراگۆس لەگەڵ ئەوەشدا کە خۆیی لەپەنا شانازییەکانی باووباپیران‌و ڕابووردووەکانیدا بەپارێزراو دەزانی بەنرخی گیانی تاوانی گوناهی ئەو بیروڕا زیانبازەی دا کە بەگومانی بۆ کۆنسوڵەکان لە مێشکی خۆیدا کۆی کردبووەوە ".وە م. فۆلیۆس[5/أ]", و منداڵەکانی کۆچی دوایانکرد. هەروەك دەسەڵاتەکانی دی چارەنوسی

---

بنەماڵەکەی‌و پلەو پایەکەیەوە هەیبوو. دواجار کاتێك دژ بەیاسا هەستا, لەسزادان نەپارێزراو, هەمان ئەو یاسایانەی کە ماوەیەکی زۆر بوو کاتلینا یاری پێدەکردن‌و هەررۆژە بە شێوەیەك پێشێلی دەکردن.

(5)أ, ب, ج, د, ه,و, بەو ڕوونکردنەوانەدا بچۆرەوە کە دەربارەی سێرڤیلیۆس ئاهالا ئاماژەمان پێکردن.





کۆمار کەوتە دەست "ماریۆس[ب]" و "والریۆس[ج]"و دوو کۆنسولی دیکە, چما "تریبۆن ساتۆرنیۆس[د]"و "پەڕتۆر سێرڤیلیۆس[ه]" تەنانەت بۆ رۆژێکیش دەرفەتیان نەبوو کە خۆیان لەدەست توڕەیی‌و تۆڵەسەندنەوەی یاساکان ڕزگار بکەن"[و].

ئێمە کە هاوشێوەی ئەو دەسەڵاتەمان لە "پیران" وەرگرتووەو بیست رۆژە شمشێری دەسەڵات لە دەستماندا خەریکە ژەنگ دەگرێت. ئێمەش هەمان ئەو دەسەڵاتە یاساییەمان هەیە بەڵام هیچ سودێکی نیەو خستوومانەتە ئەرشیفەوەستاوەکانەوە, هەروەك شمشێرێك کە لە کێلاندا بێت:

کاتلینا ئەگەر من یاسام جێبەجێکردایە ئێستا تۆ لەژیاندا نەبوویت. هێشتا تۆ لە ژیاندایت نەك لەوڕووەوە کەبتەوێت دەست لەو بێپەروایيەت هەڵبگری, بەڵکو دەتەوێت بێپەروایی‌و جەسوری خۆت زیاتر بکەیت. ئەی باوکە بەڕێزەکان[6] , من لەدڵەوە حەزدەکەم بەخشندەو میهرەبان بم. بەڵام هیچکات نامەوێت ئەم نیشتمانەم کە لەژێر هەڕەشەو مەترسیدایە بەبێهێزی‌و لاوازی تاوانبارم بکات. لەم کاتەدا خۆم مەحکوم بەلاوازی دەزانم‌و خۆم بە بێهەست‌و بێدەروەستی تاوانبار دەکەم. سوپایەك کە ڕەنگە هەرساتێك بیەوێت لەتەکماندا شەڕ بکات لە "دۆڵی ئاترۆری[7]" دامەزراوەو سەربازەکانیشی ڕۆژ بەڕۆژ لەزیادبووندایە, کەچی فەرماندەی ئەوسوپایە لەماڵی ئێمەدایەو لەنێوانماندا لە "پیران"دانیشتووە. هەموو ڕۆژێ ئەو دەبینین لەبیری

---

(6) Pere conscrit نازناوێکی سیناتۆرەکانە.

(7) ناوچەیەکە کەوتۆتە بەشی رۆژاوای شاخەکانی "ئاپینۆن"و بەرامبەر "کرۆس"ەو لەبەشی باکوورەوە بە ڕووباری "تیبەر" کۆتایی دێت.

تێکدانی کۆماردایەو بەشوێن کەرەسەیەکی تازەدا بۆ مەبەستە شومەکەی دەگەڕێت.

کاتلینا: ئەگەر لەم کاتەدا فەرمانم بدایە بتگرن‌و کۆتایی بە ژیانت بهێنن، ئایا پێدەچوو کەسێك ئەم ڕایەی منی بە بێویژدانی بزانیایە.؟ تەنانەت دەترسم خەڵکانی بەشەرەف درەنگ بەوە بزانن.

بەڵام هۆگەلێك هەبوو ئەو ئەرکەم جێبەجێنەکرد کە دەبوایە ئەنجامی بدەم‌و هێشتا ئەوبەربەستە پتەوانە بەردەمیان گرتووم.

کاتلینیا! ڕۆژێك کۆتایی بەژیانت دەهێنم تا کەسێکی شەڕانی ترو بەدخوترو هاوباوەڕت پەیدا نەبێت لافی ئەوە لێبدات سزاکەت لە هەمبەر کارەکانتا قورستر بووە. تا ئەوکاتەی کە تەنانەت یەك کەسیش بەرگریت لێبکات، تۆ دەبێت بژیت. تۆدەژیت بەڵام ژیانت هەرئەمەیە کە هەیە. دەبێت لەنێوان کاربەدەستان‌و چاودێرانی مندا گەمارۆ بدرێیت‌و هێندە چاودێریکردنم درێژە دەخایەنێت تا بەناچاری دەستەکانت کە چەکی بەرامبەر کۆمارەکەمان هەڵگرتووە وشك ببێت‌و چاوەکراوەکان‌و گوێچکە نهێنییەکان بەردەوام چاودێری هەڵس‌وکەوت‌و ڕەفتارەکانت بکەن.

هەنوکە کە تاریکی شەویش کۆبوونەوەی خائینانەی تۆمان لێناشارێتەوە، دیوارە پتەوەکانی پەنا گاکەت دەنگدانەوەی قسەکانت بۆ دەرەوە ڕەوانە دەکات. ئیتر بەکوێ هیواداریت؟ چیدی بیر لەو پیلانانە مەکەوە کە لەمێشکتدان. خەیاڵی کوشتن و سوتاندن لەبیری خۆتدا دەربکە، تۆ لەهەموو لایەکەوە گەمارۆ دراوی، ئێمە لە هەموو ئەو بریارە شومانەی لەسەرتدایە ئاگادارین، و بڕیارەکانت لای ئێمە وەك ڕۆژ ڕۆشنەو من دەتوانم وێنەیەك لەوانەت بۆ بکێشم.





ئایا لەبیرتە لە ڕۆژی 21 ی ئۆکتۆبەر لە "کۆنگرەی پیران" وتم، کە شەش ڕۆژی تر "مالیۆس"ی هاوکارت شۆڕشێکی چەکدارانە دەکات؟ کاتلینا، ئایا پێشبینیەکەم نەهاتەدی؟ کارێکی بەوچەشنە گرنگ تا ئەو ئەندازەیە خائینانە کە جێی باوەڕ نەبوو دروست پێم نەوتن ؟ لەهەمووی گرنگتر ئایا لەرۆژو مێژووی کارەکەتاندا هەڵەم کرد؟ هەروەها وتبووم، کە ڕۆژی 28ی ئۆکتۆبەر خۆشەویستترین ڕۆڵەکانی ڕۆما دەبنە قوربانی‌و لە ئەنجامی قسەکانمدا کەسایەتیە بەناوبانگەکانی ڕۆما نەك بۆ ئەوەی گیانی خۆیان لەمەترسی شەڕ ڕزگار بکەن، بەڵکو بۆ ڕزگاری وڵات لەدەست تۆ لەشار چوونە دەرەوە. ئایا دەتوانیت نکوڵی بکەیت کە لەورۆژەدا چاودێری کەسەکانی من کە بەتوندی تۆیان گەمارۆدابوو بوونە بەربەستێك کەتۆ نەتوانیت لە قبونێك لە کۆماردا دروستبکەیت؟ جا کاتێك بینیت کەسێك لە ڕۆما دا نەماوە بڕیارت دا من کە لەشاردابووم لەناو ببەیت‌و خۆت هێور بکەیتەوە.ئایا لەبیرت دێ لەیەکەم ڕۆژی نۆڤەمبەردا کە دەتویست لەپەنای تاریکیدا هێرش ببەیتە سەر قەڵای پتەوی "پرێنسێت"چۆن لەگەڵ ئەوکارە یەدەگیانەی مندا ڕووبەڕوو بوویتەوە؟ هیچ کارێکت، نەخشەیەکت، ئەندێشەیەکت لەبەرچاومدا شارراوە نییەو ئاگام لەهەموویەتی‌و، زیاتر لەمە پێدادەگرم‌و دەڵێم؛ هاوڕازی نهێنی ترین ڕازەکانتم.

ئەگەر ڕووداوی پێریێ شەو بەبیرخۆت بهێنیتەوە دڵنیادەبیت کە هەوڵ‌و تێکۆشانەکانم بۆ ڕزگاری "وڵات" لە هەوڵ‌و تێکۆشانەکانی تۆ بۆ وێرانکردنی زیاتر بووە. (ئیتر من بێپەردەو بەئاشکرا قسەدەکەم)پێرێ شەو تۆ چوویت بۆ ماڵی سەناتۆر "لیکا Leca "،و لەوێ هاوکارانی تاوانبارت کۆببوونەوە، ئایا دەوێریت نکوڵی

لێبکەیت؟ ئەگەر بتەوێت نکوڵی بکەیت من لافلێدانەکەم بەبەڵگە دەسەلمێنم. چونکە هەر لەم دانیشتەدا کەسانێك دەبینم کەئەو شەوە لەگەڵ تۆدابوون. ئەی خودای گەورە ئێرە کوێیە؟ چ وڵاتێکە؟خودایە ئێمە لەکوێدا دەژین؟ ئەمە چ دەوڵەتێکە کە ئێمە هەمانە؟ لەنێوان ئەندامانی ئەم کۆنگرەیەو لەم شورا گەورەیەدا کە چارەنووسی دنیایی تیادا دیاریدەکرێ خاینەکان بۆ سڕینەوەی منو ئێوەو ڕۆما دەسیسەکاری دەکەن. "کۆنسول", خاینەکان دەبینێتو لەگەڵ ئەواندا سەبارەت بەکاروباری وڵات پرسو را دەکاتو ئەو کەسانەی کە دەبێت خوێنیان بڕێژرێت تەنانەت بەوشەیەکی تاڵیش نایان رەنجێنێت. بەڵێ کاتلینا تۆ پێرێ شەو لەماڵی سەناتۆر "لیکا" بووی‌و لەو ماڵەدا رۆمات لەنێوان هاوکارەکانت دابەشکرد. ئەو ئەرکو ئەو پلەیەی هەرکام لەهاوکارەکانت دەبوایە بیگرنە ئەستۆ پێتگوتن. ئەوکەسانەی دەبوایە لەڕۆم بمێننەوەو ئەو کەسانەش کە دەبوایە لەتەك تۆدابن هەموویانت دەستنیشانکرد, ئەوانەی ئەرکی سوتاندنی رۆمایان پێسپێردرابوو, پێتڕاگەیاندنو, ئەو شوێنانەی دەبوایە ئاگری تێبەربدرێت بسووتێت بۆتدەستنیشانکردن. بەوانت وت کاتی رۆیشتنی تۆ هاتووەو ئێستاش کە لەرۆیشتن دواکەوتویت لەو رووەوەیە کەبوونی من بەربەستێکە بۆ جێبەجێکردنی نیەتەکانت." لەوکاتەدا دوو جەنگاوەری پاك رەسەنی رۆم[8]داواکاربوون کە تۆ لە لەدڵەڕاوکێ دەربهێننو بەڵێنیان پێدایت لەکاتی شەودا کاتێك تاریکی شەو باڵی بەسەر شاردا کێشا بێن بۆ ماڵی ئێمەو لەبەرەبەیاندا لەناو پێخەفەکەمدا بمکوژن. هێشتا بڵاوەتان نەکردبوو کە لەهەموو ئەو

[8] مەبەست لە "سەناتۆر ڤارگریتۆش"و جەنگاوەر "کورفیلۆس"ە.





باسانە ئاگادار کرام, پاسەوانەکانی خۆم زیادکردو تاقمێکی بەهێز بونە پاسەوانو بەرگری کەرم,و دەرگای ماڵەکەمم لەسەر ئەو کەسانەی کەبەفەرمانی تۆ دەیان ویست بێنە ژوورەوەو کۆتایی بەژیانم بهێنن داخست, ناوی ئەوانم پێشتر بەچەند کەسێك لەگەورەکانی هۆز وت کەلەماڵی ئێمەبوون تەنانەت سەعاتی گەڕانەوەی ئەوانیشم بۆباسکردن.

کاتلینا؛ لەڕۆم بچۆرە دەرەوەو واز لەپیلانەکانت بهێنە. دەروازەکانی شار بەڕوتا کراوەیە, بڕۆ ماوەیەکی زۆرە سوپای "مالیۆس" یان باشتر بڵێم سوپاکەت چاوەڕوانی سەرکردەکەی دەکات, هەموو هاوکارەکانت یان ژمارەیەکی زۆرتر لەوانیش لەگەڵ خۆت ببەو لێگەڕێ با شار پاكو ئارام بێت, هەرئەوەندەی دیوارێك تۆم لێجیابکاتەوە ئیتر کۆتایی بەم راگەیاندنە ترسناکە هەمیشەییە دەهێنم. نا! هەرگیز ناکرێت تۆ بتوانیت لەگەڵ ئێمەدا لەشوێنێکدا بژیت. من ناتوانم تەحەمولی چارەنووسێکی وەها بکەمو نابێت تەسلیمی چارەنووسێکی وا ببم.

سوپاسو ستایش بۆ خواوەندە نەمرەکان بەتایبەتی بۆ ژۆپیتەر کە ئەم پەرستگا پیرۆزە لەبەر ڕێزی ئەو دروستکراوەو لانەی شارستانی رۆمیەکانی پاراستووە.[9]

[9] ئاماژە بە شەڕێك دەکات کەلەنێوان "سابینەکان"و "رۆمیەکان" روویدا لەو رووەوەکە کاتێك "رۆمۆلۆس" شاری رۆمای دروستکرد کۆیلەکان لەم شارەدا کۆبوونەوە, بەڵام هۆزە جیاجیاکان رێگریان لەژنو ژنخوازی لەتەکیاندا دەکرد. رۆمۆلۆس گەلی سابینی بۆ جەژنێکی وەرزشی بانگێشتکردو لەڕۆژی ئەو جەژنەدا کۆیلەکان هێرشیان برد بۆسەریانو ژنو کچەکانیان هەڵگرتنو دوای ئەوە جەنگێکی قورس روویدا. رۆمۆلۆس

دروودو سوپاس بۆ ئەوانەی چەندان جار وڵاتیان لەدەست ئەو خوێنمژانە رزگارکرد کەمەبەستیان هەڵوەشانەوەو وێرانکردنی رۆمابوو. کارێکی نەشیاوە دەرفەت بدرێ بەخوێنمژێکی وەها تا جارێکی دی ووڵات بخاتە مەترسییەوە.

کاتلینا؛ لەو رۆژەوە کەبە "کۆنسول" هەڵبژێدراوم لەگەڵ پیلانەکانی تۆدا رووبەڕوو بوومەتەوە بەڵام داوای هاوکاریم لەکۆمار نەکردووەو بەچاودێریکردنم لەهەمبەر پیلانەکانتا هەوڵی دۆزینەوەی رێگا چارەیەکمداوە. من کۆنسۆڵ بووم بەڵام تۆو هاوکارە شەڕ ئەنگێزەکانت لە "شان دومارس" لەدوا ئەنجومەنی میللیدا[10] دەتانویست بمکوژن. ئەمەش دەرئەنجامی چاودێریو تێکۆشانی هاوڕێکانم بوو کەتوانیان بەبێ ئەوەی بۆ ساتێکیش ئاسایشی هاووڵاتیان تێکبدەن منیان لەبەرامبەر پیلانە نەگریسەکانتا پاراست. هەزاران جار کەوتوومەتە ژێر شاڵاوی هێرشەکانتەوە بەڵام هەر جارەی بەشێوەیەك خۆم لەمەترسییەکانت رزگار کردووە, لەبەرئەوەی باوەڕم بەوە بووە کەنەمانم بۆ وڵاتەکەم نەهامەتییەکی گەورە دەخاتەوە. ئیدی ئەمجارەیان تۆ شەڕت بەرامبەر کۆمار راگەیاندووەو ئەتەوێت هەموومان بکوژیت و مەبەستت ئاگرتێبەردانو سووتاندنی پەرستگای خودایانو ماڵی هاووڵاتیانو سەرانسەری "ئیتاليا"یە. هەنوکەش

---

بەبینینی حاڵی لایەنگرەکانی خۆی کەخەریکبوو شکستیان دەهێنا نەزری کرد پەرستگایەك بۆ ژۆپیتەر دروستبکاتو ناوی "ژۆپیتەر ستاتۆر (ژۆپیتەری راوەستێنەری کارسان)ی لێبنێ. هەر لەهەمان پەرستگادابوو کەشیشرۆن کۆبوونەوەی "ئەنجومەنی پیرانی" تیا ئەنجام ئەداو کاتلینای تیا خستە بەر لێپێچینەوە.

Comice (10)



ناوێرم ئەو ئەرکەی کەدەبێ پێیهەستمو فەرمانم پێدەکات, ئەنجامی بدەم, دابونەریتی باوو باپیرانم ناکەم بەسەرمەشقی,و ئەرکەکەم بەشێوازێکی ئارامترو تەکبیرەوە ئەنجامدەدەم. ئەگەر فەرمانی کوشتنت دەربکەم لەپاش تۆ هاوکارە شەڕ ئامێزەکانت لەشاردا دەمێننەوە. بەڵام ئەگەر لەرۆم بچیتەدەرەوە دوا بەدوای تۆ هاوڕێکانت کە ناپاکترینو گەندەڵترین کەسانن لەشار دەچنە دەرەوەو رۆما لەپیسی ئەوان پاك دەبێتەوە, هەر لەبەرئەوەیە من پێ لەسەر چوونەدەرەوەت دادەگرم. جێی سەرسوڕمانە! کاتلینا تۆ دوودڵیو ناتەوێت ملکەچبکەیت؟ ئەی دوژمنی رۆم, ئەمە کۆنسولە فەرمانت بەسەردا دەدا لەڕۆمان بچیتەدەرەوە. لێم دەپرسیت کەداخۆ دوورت دەخەمەوە؟ نەخێر دوورخستنەوە نییە, ئەگەر رای منت دەوێ ئەوە بۆتۆ بەباشدەزانم.

کاتلینا؛ لەم شارەدا جگە لەچەند کەس لەهاوڕێ شەڕ ئەنگێزەکانت کەلەوێرانکردنی رۆمدا لەگەڵ تۆدا هاوپەیمانن, کەسێکی دیکە نییە نەفرەتو مەترسیی تۆی لەدڵدانەبێت, ئیتر ژیانی تۆ چ بەخششێکی هەیە؟ ئایا شەرمەزارییەك هەیە ئازارەکەی بەناوچەوانتەوە نەبێت؟ گەندەڵییەك هەیە کەئاماژە بە ژیانی تایبەتی تۆنەکات؟ کام ناپاکیو کام سەرشۆڕیو کام شەڕانگیزیە کە چاوەکانتو دەستەکانتو هەموو جەستەتی ئالودە نەکردبێت؟ کام گەنجو لاومان هەیە نەکەوتبێتە ژێر فریوو تەڵەکەبازیو داوی تۆوەو بەڵێنە هەڵفریوێنەرەکانت قۆڵو مەچەکی ئەوانی بۆ جێبەجێکردنی هەوەسە ناپاکەکانت پڕچەك نەکردبێت؟ لەکۆتایدا کە هاوسەرەکەت مردو دەرگای ماڵەکەت بۆ بوکێکی تازە کرایەوەو تاوانێکت کرد ترۆپکی هەموو تاوانەکانت بوو تا هەنوکەش تاوانی لەوجۆرە ئەنجام





نەدراوە[11]. من سەبارەت بەوە هیچ شتێك ناڵێم‌و بەوپەڕی مەیلەوە هیوادارم ئەمكارەت فەرامۆشبكرێت تاله ئایندەدا كەسێك نەزانێت لەڕۆما تاوانێكی وەها گەورە كراوەو سزاش نەدراوە. من قسە لەسەر هەڵسوكەوتت ناكەم‌و هیچ كارێكم پێوە نییە كەئەمساڵ لەڕۆژی وەرگرتنەوەی "قەرزەكان[12]" وا چ وەلامێك بەخاوەن قەرزەكان ئەدەیتەوە. من لەدەربڕینی ئەو كارە روڕەشیانەت كەڕەنگێكی تایبەتی هەیەو بێئابڕوت دەكات خۆم دەپارێزم, و تەنها قسە لەسەر ئەوشتانە دەكەم كەپەیوەندی بەكۆمارو خەڵكی رۆماوە هەیە.

كاتلینا؛ ئایا دەتوانیت لەم هەوایەی هەڵی دەمژین‌و لەم رووناكیەی بۆ هەمووان دابینكراوە بەئاسوودەیی‌و ئارامی بەهرەمەندبیت؟ و لەكاتێكدا دەزانی كەسێك نییە نەزانێت كەلەیەكەم شەوی ژانوییەو دوا رۆژی كۆنسولای "لیپیدۆس‌و تۆلۆس" لەئەنجوومەنی گشتیدا بوویت‌و, ژمارەیەك خوێنمژو تاوانپیشەت لەتەكدابوو, دەتویست كۆنسۆڵ‌و هەموو پیاوە گەورەكانی ئەو ئەنجوومەنە بكوژێت. كاتێك ئەو كارەت بەئەنجام نەگەیشت, لەبەرئەوە نەبوو دەترسایت بەڵكو بەخت‌و شانس بەهانای خەڵكی رۆماوە هات كەدەستبەرداری ئەوكارە بیت‌و رۆماش نەبووە گەمەی هەواو هەوەسە نەگریسەكانت. من دەربارەی ئەو تاوانانەی كە كردووتەو هەمووكەس

---

(11) كاتلینا لەبەرئەوەی كە كوڕەكەی خۆی بەڕێگردەزانی لەبەردەم خێزان پیكەوەنانیدا لەگەڵ ئۆرلیا ئۆرستیلادا, هەر لەبەرئەوە كوڕەكەیی كوشت.

(12) خەڵكی رۆما لەرۆژانێكی دیاریكراوی لەساڵدا دەبوایە قازانجی پارەو قەرزەكانیان بدەنەوە بەخاوەن قەرزەكان. ئەو رۆژانەش بریتیبوون لەپانزدەهەمی مانگەكانی مارت‌و ئۆكتۆبەرو رۆژەكانی سیانزەی مانگەكانی دیكە.





دەیانزانێت هیچ ناڵێم, بەلام لەوكاتەوەی بووم بە كۆنسول چەند جار دژ بەگیانی من پیلانت گێڕاوە؟ چەندین رێگا چارەم بۆ بەرگری لەگیانی خۆم بەكاربردووە تا لەبەرامبەر ئەو پیلانانەی كەشارەزاییەكی تەواوت لێی هەیە بتوانم گیانم بپارێزم؟ هەر بڕیارێكت ئەداو هەر پیلانێكت دادەنا, بەدڵنیاییەوە من لەكاتی خۆیدا ئاگادار دەكرام. بەلام هیچ شتێك كاریگەری لەسەر ئیرادەت نەبوو, هیچكاتێكیش لەهەوڵ‌و تەقەلا نائومێد نەدەبوویت. چەندین جار ئەو خەنجەرەت لێسەندرایەوە كەئەتویست ئێمەی پێبكوژیت. چەند جار لەناكاودا رووداوێك دەبووەهۆی كەوتنەخوارەوەی ئەو خەنجەرە لەدەستت, بەلام هەمووجارێك سەرلەنوێ خەنجەرەكەت هەڵ دەگرتەوەو هەوڵ‌و تەقەلات دەدایەوە. پێمان بڵێ كام سوێندی ترسهێنەرو چ پەیمانێكی خاینانە هانت ئەدا بۆ چەقاندنی ئەو خەنجەرە لەسەر دڵی كونسولێك كەتا ئەم رادەیە هەوڵ‌و تەقەلای بۆ ئەدەیت؟

كاتلینا؛ ئیدی ئەمە چ ژیانێكە كە بەسەری دەبەیت؟ نامەوێت بەو سوكایەتیەی كە شایستەتە بدوێم, دەمەوێت بەبەزەییەكەوە كە شایستەی نیت قسەت بۆ بكەم. تۆ ئەمڕۆ هاتیت بۆ "ئەنجومەنی پیران", لەئەنجومەنێكدا كەئەو هەموو هاوڕێیەت هەبوو كامیان سەلامیان لێكردیت؟ ئەگەر لە "ئەنجوومەنی پیران"دا كەسێك تا ئێستا وەها سەرشۆڕی‌و سوكایەتییەكی بەخۆیەوە نەدیووە ئیدی بۆ چاوەڕێیت كەهەر ئەو شتەی بەبێدەنگی وتراوە بەشێوەی راپرسی‌و دەنگدان دەربڕێت؟ داخۆ نەتبینی كاتێك هاتیتە ناو كۆبوونەوەكەوە, جێگاكانی دەوروبەرت چۆڵبوون؟

ئایا, نەتبینی لەپاش هاتنت, ئەو کەسانەی کەتۆ دەتویست بیانکوژیت هیچکامیان لەدەوروبەری تۆ دانەنیشتن‌و ئەو بەشەش لە "تەلارەکە" چۆڵ مایەوە؟ چۆن دەتوانیت ئەو هەموو سوکایەتییە تەحەمول بکەیت؟ سوێند دەخۆم ئەگەر تا ئەم رادەیەی کەخەڵك لەتۆ دەترسن‌و لە دڵەڕاوکێدان‌و نەفرەتیان لێت هەیە, کۆیلەو غوڵامەکانم لێمبترسانایە, بەناچار ماڵ‌و ژیانی خۆمم بەجیٚ دەهێشت. بەڵام تۆ ناتەوێت رۆما بەجیٚ بهێڵیت‌و بچیتەدەرەوە. ئەگەر هاووڵاتیەکانم تەنانەت بەبیٚ هیچ بەڵگەیەك هەربەو رادەیەی کەلەتۆ نەفرەتیان هەیە لەمنیش ئەو نەفرەتەیان هەبوایە, بەدڵنیاییەوە زیاتر پێم خۆشبوو لەدیداریان بێبەش بم تا لەبەرامبەر شڵەژاوەکانیاندا نەبم. کاتێك هەڵسوکەوت‌و تاوانەکانت بەئاشکرا بوونە بەڵگەی ئەوەی کەماوەیەك هاوڵاتیەکانت جگە لەترس‌و دڵەڕاوکیٚ شتێکی دیکەیان لەتۆ نەدیووە و دیدارەکانت بۆیان جگە لەدەردوژان شتێکی دیکە نییە, بۆچی لەگوماندایت‌و ناتەوێت لە رۆما دورکەویتەوە؟ ئەگەر بەدیدارێك تەکانێك بەجەستەی باوك‌و دایکتا دەهات‌و ئەگەر هەستت دەکرد خۆشیان ناوێیت لەماڵی باوکت هەڵدەهاتی‌و لەچاویان وندەبوویت, ئەمڕۆ نیشتمان کە دایکمانە نەفرەتت لێدەکات,و لێتدەترسێت ماوەیەکی زۆرە سەبارەت بەهەڵسوکەوت‌و کارەکانت رای خۆی دەربڕیوە.

سەیرە! تۆ هێزو تواناکانی ئەو بەکەم دەزانی‌و دەتەوێت لەبەرامبەریدا یاخی بیت‌و بەرگری لەخۆت بکەیت؟ بەئاشکرا گوێم لەدەنگی نیشتمانەو پێتدەڵێت: ((کاتلینا داخۆ لەم چەند ساڵەدا تاوانێك هەبووە تۆ بەشداریت تیا نەکردبێت؟ لەهەر ئاژاوەو بەڵایەکدا تۆ دەستت هەبووەو تەنها تۆبویت لەوپەڕی بیٚ شەرمیدا مافی





خەڵکانت پێشێلدەکردو دەستدرێژیت دەکردەسەریان‌و بیٚ سزادانیش مایتەوە, لەبەرامبەر تۆدا یاساکان کوژابوونەوەو دادوەرەکان بێدەنگبوون, یان بەزمانێکی دی, ئەوان کەوتنە بەر شاڵاوی دەست درێژیەکانتەوە, هەموو ئەوکارانەت شایستەی هەڕەشەو رقم بوو بەڵام بێدەنگ مامەوەو ناچاربووم دابنیشم‌و هەمووساتێك خۆم لەمەترسیدا ببینم‌و هەموو رۆژێك لەدەست توانجی پیلانەکانی تۆ لەترس‌و دڵە راوکێدابم, تەحەمولی ئەو چارەنووسە ناکەم, برۆ لەو دڵەڕاوکێیەی کەگرفتارت کردووم ئاسوودەو ئارامم بکە. ئەگەر ترس‌و دڵەڕاوکیٚ واقیعیەتی هەبێت لەهیچ‌و پووچی رزگارم دەبێت‌و ئەگەر نیگەرانیەکانم لەوەهم‌و خەیاڵەوەیە, بەڕۆیشتنت کۆتایی بەترس‌و دڵەڕاوکێم دێت))

ئەگەر نیشتمان لەتەکتا وا قسەبکات تۆ ملکەچی نابیت؟ و ئەگەر ملکەچی نابیت ئایا تeveryone توانای ئەوەی نییە ئەوشتەی دەیەوێت لێتوەربگرێتەوە؟ لێگەڕیٚ, تۆ خۆت تاوانباریت سەلماند. ئەو سەلماندنەشت کاتێکبوو کەئامادەبوویت ئازادیت لیٚ وەربگیرێتەوە. داخۆ تۆ بۆ رەتکردنەوەی هەر گومانێك ئامادە نەبووی لەماڵی "لیپیدۆس"دا بمێنیتەوە؟ کاتێکیش تۆی لەماڵەکەی خۆی کردە دەرەوە مەگەر نەهاتیت لەماڵەکەی مندا بەند بکرێیت؟ داخۆ پێمنەگوتیت هەروەك ناتوانم لەم شارەدا لەگەڵ تۆدا بژیم لە ماڵێکی نزیك بەتۆش لەئاسایشدا نابم, کاتێك لەمن نائومێدبوویت چویت بۆلای هاوڕێی خۆشەویستی خۆت (مەتالۆس)[13]ی بەشەرەف,

(13) کاتلینا بەهەمان بوێریەوەو بۆ پیشاندانی ئازایەتی, خۆی بەبارمتە لای "مەتالۆس" ناوێك داناو خۆی بەندکردبوو. لەمێژووی رۆمدا جگە لەم

ئومێدەوار بوویت کە لەماڵەکەیدا دەتپارێزێو بەو بیرتیژییە تایبەتیەوە نەخشەکانت تێدەگاتو هاوکاریت دەکات.

باوکانی بەڕێزا! ئەو کەسەی خۆی بەشایستەی ئازادی نازانێت ئایا شایانی بەندو زینجیری نییە؟

کاتلینا؛ ئێستاکە تۆ ناتوانیت نەخشەکانت لەم شارەدا جێبەجێبکەیت, ئەدی بۆچی بۆ جێگایەکی تر ناڕۆیت تا ئەو تەمەنەی چەندان جار لەدەست دادپەروەری دەربازتکرد, لەگۆشەگیریدا بەسەری ببەیتو فەرامۆشیکەیت؟ دەتەوێت پێشنیاری دورخستنەوەت لەئەنجومەنی پیران بۆ بکەم تا ئەگەر بەباشیانزانی پشتگیری خۆیان رابگەیەنن؟و دەڵێیت کە تەسلیمی راوبۆچوونی پیران دەبیت؟ نەخێر! کاتلینا؛ من پێشنیارێك ناکەم شایانی پلەو پایەکەم نەبێت. لەگەڵ ئەوەشدا بەم زووانە لەڕای دادوەرەکان ئاگادار دەبیت. کاتلینا لەڕۆم بچۆرە دەرەوەو کۆمارەکەمان لەترسو دڵەڕاوکێ دووربخەرەوەو ئاسوودەمان بکە. ئەگەر چاوەڕێی ئەوەی وشەی دوورخستنەوە لەزمانی من ببیستیت, بەڕاشکاوی دەڵێم لەڕۆم بەرەو (تاراوگە) بڕۆ... کاتلینا؛ ئەوە چییە هەستدەکەم کاریگەری قسەکانم دەبینیت؟ سەرنج لە بێدەنگبوونی سەناتۆرەکان ئەدەیت؟ ئەوەی وتم گوێبیستی بوونو بێدەنگ دانیشتن, کاتێکیش بەبێدەنگی وەها بەئاشکراراوبۆچوونەکانی خۆیان دەربڕی ئیدی پێویست ناکات بەزمانیان دوورخستنەوەت رابگەیەنن. ئەگەر قسەگەلێکی وەهام دەربارەی "سگونتۆس"ی خۆپارێز یان "مارسلۆس"ی شەریف

---

شوێنەدا ناوی "مەتالۆس" نەبراوە. وە ئەو پیاهەڵدانەی کەلەبارەی مەتالۆسەوە دەبینرێ, گاڵتەپێکردنیەتی.





بوونایە لەگەڵ ئەوەشدا کە کونسوڵمو رێز لەم شوێنە پیرۆزەش دەگیرێت, بەڵام "ئەنجومەنی پیران" هەر دژایەتیان دەکردم, خۆ ئەگەر رووبەڕوی رقو غەزەبی ئەنجوومەنی پیران بوومایەتەوە لەجێی خۆیدا بوو, بەڵام ئەوان هەرئەوشتانەی لەبارەی تۆوە وتم گوێبیستی بوونو بێدەنگو ئارام لەجێی خۆیان دانیشتبوون! ئارامیەك کە پشتگیری لەمن دەکاتو تۆش تاوانبار دەکات, بێدەنگییەکە, لەهەر گوتەو وتارێك بەهێزترە, گیانی سەناتۆرەکان بەلای تۆوە گەلەك بێنرخە, تەنها دادوەرانێك نین کەدەربارەی تۆ رای خۆیان رادەگەیەنن, بەڵکو هەموو جەنگاوەرە بڕوادارو خۆپارێزەکانی رۆماو, هەموو کۆمەڵگای خانەدانی رۆماش کە هەنوکە لەچواردەوری "ئەنجومەنی پیران" کۆبوونەتەوەو لەکاتی هاتنت بۆ ئێرە قەرەباڵغیو سوکایەتیانت بینیو گوێبیستی سکاڵاکانیان بوویت کەسەبارەت بەتۆ داوەریان دەکردو رای خۆیان رادەگەیاند.

ماوەیەکی زۆرە هەوڵدەدەم ئەو کەسانەت لێدورخەمەوە کەدەیانەوێت بتکوژن, خۆ ئەگەر قایلبیت لەشاری رۆما کەدەتەوێت وێرانیکەیتو بیسوتێنی بڕۆیتە دەرەوە, بەئاسانی ئەو کەسانە قایلدەکەم تا دەروازەکانی شار رەوانەت بکەن.

بەڵام بڵێم چی؟ کەسێك ئومێدی هەبێ کە سروشتی سەرکەشت بگۆڕێو کارێك بکات دەست لەعینادی هەڵبگریت!و بیر لەهەڵاتن نەکەیتەوەو ژیانی تاراوگە هەڵبژێریت, بەداخەوە هیچکات خواکان ئیلهامی بڕیارێکی لەوجۆرەت پێنابەخشن! ئەم حاڵەتەش بەدوور نازانم رۆژێك وتارەکانم ترسێك بخاتە بوونتەوە کە ناچارت بکات بڕۆیت, رەنگە ئەو زریانەی نەفرەتو رقی خەڵکانی دژ بەتاوانەکانت دروستکردووە بەشێوەیەکی کاتی ئارام بێتەوە, بەڵام درەنگ یان زوو

خەڵکی وا دەزانن کەمن سەبارەت بەتۆ کەمتەرخەمیم کردووەو من بەهۆکاری دەربازبوونی تۆ دەزانن‌و زریانی رق‌و نەفرەتیان بەسەرما دادەباریٚ, بەڵام بۆ رزگاری کۆمار پێشێوازی لەم مەترسییەو هەر مەترسییەکی دیکە دەکەم. بەڵام کیٚ دەڵێت تۆ واز لەوهەڵسوکەوتەت دێنی‌و لەبەرامبەر یاساکاندا ملکەچ دەبیت, یان بۆ نیشتمان قوربانی ئەدەیت هەرگیز ئەم شتانە لەتۆ چاوەڕوان ناکرێت, نەخێر کاتلینا کەس باوەڕ ناکات کەشەرم‌و ئابڕو, کارێك بکات دەست لەتاوان هەڵبگریت‌و ترس لەمەترسی دورتخاتەوە عەقڵ‌ولۆژیك ئاگری رقت دامرکێنێتەوە. ئێستاکە من بەدوژمنی خۆت دەزانیت قایلبە بەدورخستنەوەو بڕۆو لێگەڕیٚ با لافاوی نەفرەتی خەڵکی بەسەرمندا داباریٚ‌و بەرپرسیارێتی دورخستنەوەت بالەسەر شانی کۆنسولێك بێت کە تۆ بۆ تاراوگە دەنێرێت, ئەستەمە بتوانم لەبەرامبەر ناڕەزایی کۆمەڵانی خەڵکدا خۆ راگرم. بەڵام ئەگەر دوژمنایەتی لەبیر خۆت بەیتەوەو بتەوێت هەنگاوێك لەڕێگای شانازی مندا بنێیت کارێکی شیاوە, کەلەگەڵ تاقمە نەگریسە ئالودەکەتدا لەشار بڕۆنەدەرەوەو خۆتان بگەیەنن بەمالیۆس‌و هەموو ئەو شەڕانگێزانەش لەدەوری خۆت کۆبکەرەوە.

لێگەڕیٚ با خەڵکی پاك‌و چاکی رۆما لەوان جیا ببنەوە. ئەوسا بەیداخی سەرکێشی‌و چەتەیتەتان هەڵگرن‌و لەگەڵ نیشتماندا شەڕ دامەزرێنن, ئیتر کەس ناڵیٚ تۆم بۆ شوێنێکی نادیارو دوور رەتاندووە, هەموو دەزانن تۆم بۆلای هاوڕێکانت رەوانەکردووە, بەڵام چ پێویستییەکت بەم کارە هەیە کاتێك ئاگادارم ماوەیەکە کەسە





چەکدارەکانت لەشار ناردووەتە دەرەوەو لە "ئۆرلیا"[14] چاوەڕێت دەکەن, تەنانەت ئەو رۆژەشت دیاریکردووە کەبڕیارە بەمالیۆس بگەیت ئەو "هەڵۆ زیوی"[15]"یەی کەلەماڵەکەتدا بوو وە پەرستگایەکت بۆ دروستکردبوو تا "نەزرو نیازی" تاوانە چەپەڵەکانت بێتەدی پێش خۆت رەوانەی ئەو شوێنەکردووە, هیوادارم تۆو لایەنگرانت کاتێکی ناخۆش بەسەر بەرن. نەخێر! دڵنیابە لەو قوتابخانەیە ماوەیەکی زۆر دورناکەویتەوە کەپێش هەر تاوانێك ئەو نەزرو نیازەت لەبیر نەدەکردو چەندان جار پەرستگاکەیت بەمەبەستی ئالودەکردنی دەستەکانت بەخوێنی خەڵکانی بیٚ تاوان. بەجێدەهێشت.

تۆ دەڕۆی دواجار بەو شوێنە دەگەیت کە لەدێر زەمانێکەوە تامەزرۆی بوویت, لەم نشێوەدا کەبۆخۆتت هەڵبژاردووە بەرەوپێش دەڕۆی, ئەم سەفەرە نەك تەنها کارت لێناکات بەڵکو گیانت لەرازی بوون‌و خۆشیەکی ئەوتۆ لێوانلێو دەکات, هەر لەبەر ئەمجۆرە وروژاندنەیە کەسروشتی خولقاندووەو لەبەر ئەوشتانەش پەروەردەی کردویت‌و چارەنووسی دیاریکردویت. تۆ دوژمنی ئارامی‌و ئاسایشی, ئەگەر شەڕ کارێکی تاوانبارانە نەبوایە ئەوا شەڕیشت پەسەند نەدەکرد. تۆ سوپاکەتت بەگوێرەی هەوەس‌و ئارەزووەکانت

(14) رێگای (ئۆرلیا) ئەو ریگەیەبوو کەشاری "رۆما"ی بە "ئاترۆی"یەوە دەبەستەوە.

(15) وەك ئەوەی دەگێڕنەوە سالۆست, هەر ئەو هەڵۆ زیویەیە کەمارلۆس لەجەنگدا لەگەڵ "سومبر"ەکاندا پێی بوو, لەساڵی 102ی پێش زایین دانانی هەڵۆ لەسەر ئالاٚ بووەباو.

پێکەوەناوە, سوپایەك کە لە کۆمەڵە کەسێکی زۆڵ پێکهاتووە ئەو کەسانەی لەسوپاکەتدان "بەخت" ڕووی لێوەرگێڕاون‌و ئومێدیان بەشوێنێك نەماوە, لەنێوان ئەواندا چ خۆشی‌و لەزەتێك چاوەڕێت دەکات؟ چێژێکی زیاترە لەوەی لەنێوان ئەو هەموو کەسانەی کەلێت کۆبوونەتەوە تەنانەت مرۆڤێکی چاك نەبی, بەدڵنیاییەوە تۆ خۆت بۆ ژیانێکی وەها پڕ لەشانازی ئامادە دەکردو ڕادەهێنا, هەر لەبەر ئەم ڕۆژانەبوو لەسەر زەوی ڕەق دەخەوتیت تا بواری دەستدرێژیکردنە سەر ناموسی بنەماڵەکان‌و گیانی خەڵکیت هەبێت, شەونخونیت دەکێشا تا لەخەوی قوڵی پیاوێك یان لەپشوودانی دەوڵەمەندێك کەڵك وەریگریت‌و نیازە دەزێوەکانت جێبەجێ بکەیت. هەنوکە دەبێت یارمەتی لەهێزی خۆت وەربگریت‌و لەبەرامبەر سەرماو گەرماو برسیەتی‌و هەزاران نەهامەتی تر کەچاوەڕێت دەکات وەدواجاریش پەژموردە دەبی, خۆت ڕابگریت. بەدوورخستنەوەت لە "کۆنسولا" لانیکەم خزمەتێك کە دەیکەم ئەوەیە ئیتر نیشتمان لەژێر دەست درێژی کەسێکدایە کەدوورخستنەوەو وێرانکردنی بەدەستی کۆنسولێك ئەنجام نادرێت, ئیتر جەنگێك لەئارادا نییە, چەتەیەك دەست ئەداتە چەتەیی.

ئەی باوکانی بەڕێز ڕەنگە نیشتمانەکەم دەربارەی ئەوەی کە کردوومە سەرزەنشتم بکات, سەرزەنشتێك کەزۆریش بەجێیە, من بەرلەوەی لێپرسینەوەم لەتەکدا بکرێ بۆ خۆم پێشوازی لێدەکەم, سوێندت دەدەم سەرنجی ئەو شتە بدەیت کەدەیڵێم‌و بەرگری کردنەکانم فەرامۆشیکەیت. ئەگەر نیشتمانەکەم کەلەدیدی منەوە





هەزاران جار لەگیانم خۆشەویست ترە, یان ئیتالیاو کۆمارەکەمان لۆمەمان بکات‌و پرسیار بکات, شیشرۆن چی دەکەیت؟ ئەو کەسەی دەزانیت دوژمنمە, ئەوکەسەی خۆی بۆ جەنگێکی ناوخۆ ئامادە دەکات‌و بۆ شاڵاوهێنان‌و ڕاووڕووت سوپایەکی ئامادەی هەیەو کۆیلەکانی یاخیکردووەو خراپەکاری لەخۆی کۆکردووتەوە یان کەسێك کە سەبەبکارو هۆکاری گەورەترین تاوان‌و جنایەتەکانە, سەرکردایەتی وەها پیلانگەلێکی خائینانەی بەدەستە, داخۆ ئازادی دەکەیت؟ دەرگای شاری بۆدەکەیتەوە تا بڕواتە دەرەوە؟ تۆ نازانیت هەڵسوکەوتت نەك تەنها نابێتە هۆی ئاسایش, بەڵکو کۆت‌و زنجیری ئەو پیاوە ترسناکە دەکەیتەوە کەئاسایش‌و ئارامی لەخەڵکی تێکداوە. بۆچی فەرمان نادەیت کۆتو زنجیری بکەن؟ بۆچی کۆتایی بەتەمەنی ناهێنێت؟ بۆچی ئەشکەنجەی ناکەیت؟ چ بەربەستێك لەبەردەمتایە؟ دابونەریتی باوو باپیرانمان؟ ئەوان ئەگەر تەنانەت کەسانێکی ئاسایی بووبن کاتێك کەسێکیان بەتێکدەری ئاسایشی کۆمەڵایەتی دادەنا, بەدەستی خۆیان سزای مەرگیان بەسەردا داسەپاند. دەڵێت بەپێی ئەو یاسایانەی کەهاولاتیانی ڕۆمای پێتاوانبار دەکرێ دڵنیایان بۆدەستەبەر دەکات؟

لەڕۆما هەر کەسێك ئاژاوە بنێتەوە بەهاوولاتی لەقەڵەم نادرێت, لەئایندەو لێپرسینەوە دەترسیت؟ ئیدی ئەمە لەڕاستیدا ئەوپەڕی پێزانینە لەبەرامبەر خەڵکیدا, کەبتەوێت سەرفرازی هاوولاتیان بکەیتە قوربانی لەپێناوی گومانی بێهودەو ترست لەئاییندە, هەرئەو خەڵکەبوو کە بێگوێدانە پێگەی خێزانیت لەتەك ئەو هەموو

گومانانەشدا کە لەنەژادت دەکرا تۆیان پلە بەپلە لەکۆمەڵگادا بەرزکردەوە تا بەگەورەترین پلەو پایە گەیشتیت.

سەیرە! لەتانەو لۆمە دەترسی؟ دەترسی لەوەی نەك لەئایندەدا تاوانبارت بکەن؟ بۆچی ناتەوێت بەهەنگاونانێکی بوێرانە بەتاوان قایلبیت تا چیتر تاوانبار نەکرێیت بەوەی خیانەتت لەوڵات کردووە؟ پاشان وادەزانیت ئەگەر ئیتالیا دوچاری مەینەتی شەڕ بێتو شارەکان خاپورو ماڵەکان بسوتێن لەهەمبەر تۆڵەی خەڵکیدا پارێزراو ئەبی؟

بەم قسانەی نیشتمانو ئەو بیرە نهێنییەی کەلەم بارەیەوە بەخەیاڵی کۆمەڵگادا دێت بەچەند وشەیەك وەڵام دەدەمەوە: بەڵێ باوکانی بەڕێز ئەگەر بمزانیایە لەناوبردنی کاتلینا بۆ وڵاتەکەمان سودمەندە, ساتێك لەکوشتنی ئەو پیاوە خوێنمژە دوو دڵ نەدەبووم. ئەگەر پیاوانی گەورەو رێزدار بەکوشتنی کەسانی ناپاکی وەك "ساتۆرینۆس و د. گراگو نلاکۆس" شانازییەکی هەمیشەییان بەدەستهێناوە, هیچ نەدەبوو ئەگەر منیش پیاوکوژێکی خوێنمژ بکوژمو نەکەومە بەر رقو نەفرەت, گریمان رۆژێك رای گشتی دژم بوەستێ لەوەناترسم چونکە باوەڕم هەبووەو هەیە کەدەبێت لەپێناوی خزمەت بەکۆمەڵگا بوێربمو ئەگەر لەپێناوی خزمەتێکدا کە لەسەر بنەمای باوەڕداریو چاکێتیدا سەرنجی رای گشتی لەدەست بدەم نەك تەنها سەرشۆڕی نییە, بەڵکو لەڕاستیدا بەرزترین پلەی شانازییە.

لەناو خەڵکانێکدا کەبەمشێوەیە بیردەکەنەوە, هەندێك هێشتا هەستیان بەمەترسیگەلێك نەکردووە کەهەڕەشە لەبوونمان دەکاتو,





یان نایانەوێ هەستی پێبکەن. هەرئەمانە بوون بەو ئامۆژگاریە نابەجێیەی خۆیان کاتلینایان ئومێدەوارکردو بەبێ ئەوەی پێبزانن ئاگری پیلانەکەیان زیاترکرد, ئەگەر کاتلینا سزا بدەم, ئەمانە لەگەڵ هەندێ کەسانی شەڕئەنگێزو کەسانێکی هەڵخەڵتێنراودا هاوئاهەنگ دەبنو تاوانبارم دەکەن کەستەمو دەستدرێژیم لەکاتلینا کردووە.

بەڵام! ئەگەر دەرفەت بەکاتلینا بدرێت تا خۆی بگەیەنێتە سوپاکەی "مالیۆس" ئیدی ئەوانە نکۆڵی لەپیلانەکانی بکەنو, تەواوی خەڵکی لەهەمبەر ئەو مەترسیە رێگاچارەیەك دەدۆزنەوە, لەهەموو ئەمانە گرنگتر ئەوەیە ئەگەر کاتلینام بکوشتایەو لەسێدارەم بدایە, هەرچەند بەڕوکەش بڵێسەی ئاگرەکان دادەمرکانەوە, بەڵام کورەی ئاگرەکە دەمایەوە. ئەمە لەکاتێکدایە ئەگەر کاتلینا لەحەساری شاردا بچێتە دەرەوەو هاوڕێکانی لەتەك خۆیدا ببات, ئەوانەش کەژیانی خۆیان دۆڕاندووە, نائومێدانە بەدوایدا بڕۆنو هەموویان لەخۆی کۆبکاتەوە, ئەوسا ئەم ئاگرەی کەکاری لەناخی کۆمارکردووە بۆ هەتا هەتایە دەکوژێتەوە, ئەوکاتە نەمامی گەندەڵیو ئەم نەخۆشیە بکوژەی هەڕەشە لەبوونمان دەکات, لەڕیشەوە دەردەهێنرێت.

باوکانی رێزدار ماوەیەکە ئێمە لەهەمولایەکەوە لەنێوان پیلانەکاندا گەمارۆدراوین, ماوەیەکە ئێمە لەنێوان تەڵەترسناکەکاندا هەنگاو دەنێین, چارەنووس ئەوەبوو شوێنەواری هەموو ئەم دەسیسەو پیلانانەو تەواوی ئەوتاوانانەی بەنهێنیو بێدەنگ داڕێژرابوون لەرۆژگاری کۆنسولایی مندا ئاشکرابێت.

ئەگەر لەم پیلانەدا سەرۆك‌و سەركردەی شەڕانگێزەكانم لەسێدارە بدایە, ڕەنگە بۆ ماوەیەك بڵێسەی ئاگرەكان دابمركایاتەوە, بەڵام بناغەی ترسناكی لەگیان‌و ڕۆحی كۆماردا دەمایەوە. ئەگەر نەخۆشێك كە گەرمای (تا)دەیستوێنێ قاپێك ئاوی ساردبخواتەوە بۆ ساتێك تاكەی لەبیردەچێ بەڵام ئەم دەرمانە هەڵ فریوێنەرە بەنرخی گیانی تەواودەبێت, بوونی ئەم مرۆڤە ترسناكە بۆ كۆمار نەخۆشییەكی دروستكردووە بە مردنیشی كۆمار دەفرێك ئاوی سارد دەخواتەوە, بەڵام تا ئەوكاتەی هاودەستان‌و لایەنگرانی ئەو پیاوە لە ژیاندابن نەخۆشیەكە دەمێنێتەوە, لێگەڕێن ئەم تاقمە شەڕئەنگێزە لە شار بڕۆنە دەرەوەو لە شوێنێكدا كۆببنەوەو خۆیان لە خەڵكانی خانەدان‌و شەریف جیابكەنەوە, بڕۆن‌و لەئێمە دووربكەونەوە تا ئیتر گیانی "كۆنسول" لەماڵەكەی خۆیدا پارێزراوبێت, تادادوەرەكان ئازادی خۆیان بەدەستبهێنن, تا ئەنجومەنی پیران لەكاتی شەودا هەڕەشەیان لێنەكرێت لێگەڕێن با ئەو مەشخەڵانەی بۆ سوتاندنی ماڵەكانمان ئامادەیان كردبوو لەگەڵ خۆیاندا ببەن, لێگەڕێن با ئەو بیروڕایانەی لە مێشكیانەوە تێدەپەڕێ بەتەوێڵیانەوە بلكێت.

# وتاری دووەم

# وتاری دووەم

**((ئەم وتارە لەرۆژی 9ی نۆڤەمبەر لە بەرامبەر کۆمەڵانی خەڵکیدا پێشکەش کراوە))**

ئەی جەماوەری ڕۆم: دواجار کاتلینا ئەو خائینە بوێرە بێشەرمەی لەبیری تێکشکاندنی کۆماردا بوو, شێتێك کە تینوویەتی تاوانە دزێوەکانی بەخەنجەر هەڕەشەی لە دڵتان و بەئاگرتێبەردان هەڕەشەی لە ماڵەکانتان دەکرد, لە شارچووەدەرەوە.

ئەومان لەشارکردەدەرەوە, یان بەزمانێکی دی, دەرگاکانی شارمان بۆ کردەوەو بە خوداحافیزی بەڕێمانکرد بەڵێ؛ ئەی جەماوەری ڕۆم, ئەوڕۆیشتو هەڵهات, تورەییو دێوانەیی لێدوورخستینەوە, ئیدی پیاوێکی خوێنمژ نییە کە هەوڵبدات لەناوەوە ڕۆما خاپووربکات. ئیدی دەتوانین لەم سەرکەوتنەماندا لەبەرامبەر سەرۆکی شەڕانگێزەکان دڵنیابین, ئیتر خەنجەرەکەی ئەوبکوژە بەدوای ڕێگایەکدا ناگەڕێت دڵمان بپێکێت. ئیتر ئەو لە "شان دومارس"و لە "ئەنجومەنی پیران"و تەنانەت لەماڵەکانیشماندا خۆی بۆ حەشارنەداوین, بەدەرکردنی پێگەکەی لەق بوو. ئیتر ئەو دوژمنێکە لەتەکیا شەڕێکی ڕاستەوخۆو ڕەوا دەستپێدەکەین. ئیتر کەس ناتوانێت لەم ڕووەوە سەرپێچی بکات. ئەمە بۆ ئێمە سەرکەوتنێکی گەورەو دەستکەوتێکی باش بوو,





ئەومان ناچار کرد ڕووپۆش لەسەر روخساری لابدا. ئەو ئیدی بەئاشکرا ئاڵای یاخیبوونی بەرزکردۆتەوە.

ئەو بەئێشو ئازارێکی زۆرەوە ڕۆمای جێهێشت, چونکە دەرفەتی بۆ نەڕەخسا خەنجەرەکەی بە خوێن شەلاڵ بکاتو ئەو گیانەم دەرکێشێ کەلای من نرخێکی ئەوتۆی نییە. چ نائومێدیو شکستێك لەوە گەورەترە کە دەبینێ خەڵکی ڕۆما بەئارامیو لە ئاسایشدا درێژە بە ژیانی ڕۆژانەی خۆیان دەدەن و دیوارەکانی شاریش لەشوێنی خۆیان توندوتۆڵ وەستاون. بەزوویی پەی بەبەرفراوانیو گەورەیی شکستی خۆی دەبات, نائومێدو خەمبار پشتیکردۆتە ڕۆم بەڵام هەموو ساتێك چاوەکانی بڕیوەتە شارێك کە قەدەرو چارەنووس ئەوشارەی لەدەست ڕقو تورەییو دوژمنایەتی ئەو ڕزگار کردووەو خەڵکەکەشی شادمانن لەبەڵای ئەو بەدوورن ڕۆماش لەوەی کە کەسایەتییەکی وەها ئالودەی لەناخیا ڕەتاندووە پێدەکەنێو بەحەسرەتەوە تەماشا دەکات.

ئەگەر کەسێك لە ئێوە لەوپەڕی نیشتمان پەروەریو دەمارگیریدا (کە هەمووومان دەبێ وابین) ئەو شتەی من بەناوی سەرکەوتن ناوزەدی دەکەم, بەخیانەتی بزانێتو تاوانبارم بکات بەوەی بۆچی دوژمنێکی وەها ترسناکم (کە دەبوایە سزا بدرێت)ئازاد کرد, من بەهۆی ئەو بارودۆخەوە پاساو بۆ کارەکەم دەهێنمەوەو بێتاوانی خۆم دەسەلمێنم.

بەڵێ هاووڵاتیەکانم, کاتلینا دەبوایە ماوەیەك لەمەوبەر بەتاوانی کەتنەکانی بکوژرایە. دابو نەریتی باووباپیرانمان لەبەرامبەر داگیرکەرانداو ئەو دەسەڵاتەبەرفراوانەی پێمدراوەو هەروەها بەرژەوەندییەکانی وڵات هەموو وا دەخوازێ ئەو سزابدرێت, بەڵام کەم

نەبوون ئەوكەسانەی باوەڕیان بەقسەكانم نەدەكرد كە كاتلینا چ شتێكی لەمێشكدایە هەروەها ئەوكەسانەی لەڕووی گێلیو نەزانییەوە قسەكانی منیان بەوەهمو خەیاڵ دەزانی, یان ئەوكەسانەی كارە دزێوەكانی ئەویان بەقابیلی لێخۆشبوون دەزانی, یان ئەو بێچارانەی ئارەزووی سەركەوتنیان بۆ دەخواست.

لەگەڵ ئەوەشدا ئەگەر بمزانیایە بەكوشتنی ئەو ئێوە ئاسوودەو ئارام دەبن بەنرخی ئاسودەییو ئارامی ئێوەو تەنانەت بەنرخی گیانم ئێوەم لەدەست ئەو ئازاد دەكرد.

بەڵام كەسانێك لەنێوتاندا هەبوو كەراستی پیلانەكەیان قبووڵ نەدەكرد, ئەگەر كاتلینام بە سزادانێك كەشایانی بوو مەحكومبكردایە, ئەوكەسانە رقو قینی رای گشتییان لەدژم دەووروژاندو دەبوون بە بەربەستێك كەئیتر هاوڕێو هاوكارەكانی سزانەدەم, لەم ڕووەوە كارەكەم بەئێرە گەیاند. تا پەردە لەسەر كەسایەتی لابدەم,و ئەمڕۆش دەتوانن لەگەڵ ئەم دوژمنەدا بەئاشكراو راستەوخۆ رووبەڕوو ببنەوە. هەنوكە كەئەو لەشاردا نییە خۆتان دەتوانن دەربارەی ئەو مەترسییە گەورەیەی هەڕەشەی لێدەكردین دادوەری بكەن. من بەداخەوەم كەبۆچی ئەو پیاوە هەموو هاوڕێو هاوكارەكانی لەگەڵ خۆی نەبرد؟ ئەو "تۆنزلیوس" ناوێكی لەگەڵ خۆی برد كە هاوڕێی كارە دزێوەكانی سەردەمی لاوی بوو, "پۆبیلۆس" و "مونتانیۆس"ی لەگەڵدایە لەمەیخانەكاندا هێندە قەرزی شەرابیان بەسەردا كەڵەكەبووە كەهیچ مەترسییەكیان بۆ وڵات نییە. بەڵام لەنێوان هاوڕێكانیدا كەسانێكیش لەڕۆما ماونەتەوە كەناونیشانو دەسەڵاتیان بۆ كۆمارەكە مەترسییەكی گەورەیە. بەبۆچوونی من بەوگرووپە بەهێزانەمان راهێنراونو ئەو گرووپانەش





"مەتالۆس" سەرقاڵی كۆكردنەوەیانەو كەرۆژانە دادەمەزرێنو سوپایەك كە لەتاقمێك پێرەمێردو بێهێزەكانو تاقمێك رەعیەتو جووتیاری زیان لێكەوتووی بێكارو تاقمێك قەرزار كە لەدەست یاسا هەڵدێنو دەچنە ژێر ئاڵای یاخیبوونەوەو تاقمێك لەوكەسانەی كەپێویست ناكات نوكی خەنجەریان پیشانبدرێت بەڵكو تەنها ئەوەندەیان بەسە كەبڕیاری دادگایان پێڕابگەیەنرێت, تاملكەچبن. جا سوپایەكی ئاوا "پولێكی قەلب" ناهێنیو سوكایەتی پێدەكەم. بەڵام لەبەرامبەردا كەسانێك هەن بەچاكترین بۆنو بەرامە خۆیان بۆنخۆشدەكەنو بەڕواڵەتێكی رێكوپێكەوە هەموو رۆژێك لە "مەیدانی گشتی فرۆم"دا خۆیان نیشان ئەدەن لەدەوروبەری ئەنجومەنی پیران دەردەكەون وەتەنانەت لەئەنجوومەنی پیرانیشدا رێیان پێ ئەدرێت. ئەو كەسانە ئەندامی سوپاكەی كاتلینان كەلەناو شاردا ماونەتەوە, ئومێدەوارم بەزوویی لەشار برۆنە دەرەوە. چەند خۆش دەبوو هەڵاتوانی سوپاكەی كاتلینا لەناوماندا بچوونایە دەرەوە.

خەڵكینە: مەترسی كاتلینا تا رادەیەك لەمەترسی ئەمجۆرە كەسانە كەمترە, دەبێت لەم تاقمە بترسین ئەوان هەرچەندە دەزانن ئێمە لەشێوازی كارەكەیان ئاگادارین. بەڵام هێشتا لەناوماندا ماونەتەوەو هیچ ترسێكیان نییە. دەزانم لەكاتی دابەشكردندا "ئاپۆلی" بەركێ كەوت. دەزانم "ئاترۆری"یان بەكێ سپاردو "گۆل" و "پیسنۆم" بەكێ دراوەو دەیویست خۆ بەخشانە ئاگر لەڕۆم بەربداو خاپوری بكات. هەموو بڕیارەكانی پێری شەویان بەمن گەیشتووەو بۆم روونبووەتەوە. دوێنێ لە "ئەنجومەنی پیران" گوزارشتی ئەو رووداوانەم راگەیاندو ئەوانیش ئاگاداركراونو هەمووشت دەزانن.

کاتلینا لەگەڵ ئەو هەموو شەڕەنگێزیەیدا ترساو خۆی دەربازکرد, هاوڕێو هاوکارەکانی ئیتر چاوەڕوانی چیدەکەن؟ ئەوانە بەهەڵەدا چوون ئەگەر بەزەیی و لێبوردنی من بەبێ کۆتایی دەزانن.

ئەو مەبەستەی هەمبوو بەدی هات, ئیدی کەسێك نییە لەئێوە بەئاشکرا ئەو پیلانە سامناکانەی دژ بەکۆمار دایان ڕشتبوو نەبینێتو نەزانێت کاتلینا هەندێ هاوڕێو هاوکاری هەبووە. ئیتر سەردەمی چاوپۆشیو لێبوردن بەسەرچووە, تەواوی ئەو هۆکارانە فەرمانم پێئەدەن کەکارو باری خۆم بەتوندیو دژواری ئەنجامبدەم لەگەڵ ئەوەشدا لێبوردنێکی تر سەبارەت بەهاوڕێکانی کاتلینا دەردەکەمو ئەوان ئازادن کە لەچوار دیواری شار بڕۆنە دەرەوەو لەناو ئێمەدا نەمێنن. کاتلینا لەئاگری دووری ئەواندا دەسوتێو حەیفە بهێڵن ئەوەندە چاوەڕوانیان بێت, کەسانێکیش کە شارەزانین ڕێگایان پێ پیشان ئەدەم با بەپەلە لەکاتی شەودا لەڕێگای "ئۆرلیا"وە پەیوەندی پێوە بکەن. ڕۆم چ خۆشبەختیو کامەرانییەکی دەبێت ئەگەر لەژێرباری گەندەڵیو شەڕ ئەنگێزی ئەم تاقمە نا بەکارانە ڕزگاری بێت. کە کاتلینا ڕۆیشتووە هەوا تا ئەو ڕادەیە پاکە, بەئاسانی هەناسە دەدەین, ئایا تاوانو شەڕ ئەنگێزییەك هەبوو کەلەبیرەوەری ئەودا دانەچۆڕابێت؟ ئایا لەسەرانسەری ئیتالیادا دزو پیاوکوژو هەرزەو فێڵبازو بەد ناوێك هەیە نەڵێت ڕۆژگارێ لەگەڵ کاتلینادا پەیوەندیەکی نزیکم هەبووە؟ و لەم چەند ساڵەدا لەکام تاوانی ئەودا بەشداری نەکردووە؟ چ شەرمەزاریو سەرشۆڕییەك هەیە کەدامەنی کاتلینا ئالودەی نەکردبێت؟ کێ هەیە وەك کاتلینا جادوی لەلاوانی کالفامو خەڵکانی ساویلکە کردبێتو هەڵیخەڵەتانبێت؟ بەهەمووکەسێ بەڵێنی ئەنجامدانی ئارەزووەکانی دەدا, دیمەنی ژیانی بۆ تاقمێك





دەکێشا لەپاش مردنی باوکیانو هانی ئەدان باوکیان بکوژنو بۆ ئەنجامدانی ئەوکارە شومەیان هاریکاری دەکردن, بەپەلە توانی لەناو شارو دەوروبەریدا کەسانێکی گەندەڵو بەرەڵڵا لەخۆی کۆبکاتەوە, لەسەرانسەری ئیتالیادا مرۆڤێکی قەرزارو زیانبارو هەڵشکاو نیە لەگەڵ ئەو تاقمە خیانەتکارەدا پەیوەندی نەبووبێت.

لەگەڵ ئەوەشدا دەبێت کۆمەڵگا دەستخۆشییکات لەو هەموو چێژو سەلیقە جۆراوجۆرەی کەلەبوونی کەسێکدایە. لەسەرانسەری ئیتالیادا ناتوانین لەناو کۆڕو کۆمەڵانی بەرەڵاو لاتو چەتە شەڕەنگێزەکاندا شەڕانیو شەڕخوازێکی بێ بەزەیی (کەبەرگەی هەموو زەبرێکی کوشندە دەگرێت) بدۆزینەوە کەهاوڕێی کاتلینا نەبێتو لەهیچ تەماشاخانەیەکدا پیاوێکی ناشرینو گاڵتەچی بچووكو بێنرخ نییە شانازی بەهاوڕێیەتی کاتلیناوە نەکات. ئەم کەسایەتیە لەقوتابخانەی تاوانو بەرەڵایی پەروەردە کراوە, لەبەرگەگرتنی بەرامبەر برسیەتیو تینوویەتیو بەرگری لە هەمبەر دژواریەکاندا لەنێوان هاوڕێکانیدا نموونەیەکی بەرچاوە.

سروشت ئەو هەموو تایبەتمەندیو تواناییەی پێداوەو ئەم نمەك نەناسە هەموو ئەوانە لەپێناوی گەندەڵیو خراپەکاریدا بەکاردەهێنێت. ئەگەر هاوڕێکانی بەدوایدا بڕۆنو ئەم تاقمە گەندەڵو ئالودەیە کە سامانو شەرەفیان دۆڕاندووە لەڕۆم بچنەدەرەوە چ شادمانییەك بۆ کۆمارو چ شانازییەك بۆ سەردەمی "کۆنسولا"ی من فەراهەمدەبوو. ئیدی بێشەرمیان سنوری نیەو تەحەمولناکرێت, ئەو سەردەمانەی کە سنورێك بۆ ئارەزووەکانیان هەبوو, بەسەرچووە, جگە لەکوشتارو ڕاوو ڕوتو سوتاندن ئامانجێکی دیکەیان نییە. ئەمانە کەسانێکن میراتی باوکیان بەباداوە, هەموو متمانەیەکیان

لەدەستداوەو لەوپەڕی نەهامەتیو فەلاکەتدا دەژین. بەڵام لەگەڵ ئەو هەموو هەژاریو نەهامەتیانەی کە هەیانە لە ژیانی رابواردنو جوانکاری دەست هەڵناگرن، ئەگەر تەنها بەبادەخواردنەوەو شەونخونیو قومارو لەچێژە بێ نرخەکانی تر کەمایەی سەرگەرمییانە رازیبونایە (لەگەڵ ئەوەی کەهەموو ئەم کارانە مایەی رەخنەگرتنە) تەحەمولدەکران. بەڵام چۆندەبێ ئەو جەنگەی لەنێوان شەرمەزاریو شەرەف، شێتیو لۆژیك، دەستبلاویو قەناعەت، ناهوشیاریو هۆشیاریدا دەستی پێکردووە تەحەمول بکرێت؟ من دیمەنی شەوێکی جەژنو ئاهەنگی ئەوان دەهێنمە بەرچاو کە بەسەرخۆشیو شلو شێواو لەسەر بالیفە نەرمو نۆڵەکان راکشابوون گوڵە جوانەکان ناوچەوانی دەرازاندنەوە، خواردەمەنییە خۆشەکان تامی دەمیانی شیرین دەکرد، بۆنو بەرامەی خۆش مێشكو رۆحیانی هێوردەکردەوە، لەهەمان کاتدا مێشکیان لەژێر کاریگەری بێ نرخترین هەوەسدا بە وشەی کوشتنو راوڕووتو سوتاندن لوتفو جوانی بەقسەکانیان دەبەخشی. گومانم نییە دەستی قەدەر ئەوان بەرەو چارەنووسێکی شوم رادەکێشێت، ئەگەر تا ئێستا بەسزای تاوانەکانیان نەگەیشتوون، بێگومان رۆژی سزا دوور نییە، ئەگەر لەسەردەمی "کۆنسولا"ی خۆمدا ئەو ئەندامە گەندەڵانەی هەڕەشە لەژیانمان دەکەن، لەناوبەرم، چەندان سەدەخۆشیو کامەرانیو ژیانی ئاسایی بۆ رۆم دابین دەکرێت. لەهەموو جیهاندا لەلایەن هیچ گەلێکەوە مەترسیمان لەسەر نییە، هیچ پاشایەك دەسەڵاتی دەست درێژکردنە سەر رۆمای نییە، لەهەموو جیهاندا لەدەرەئەنجامی هەوڵو تێکۆشانەکانی "پەمپەی قارەمان" ئاشتیو ئاسایش بەرقەرارەو تەنها جەنگی ناوخۆیە کەهەڕەشەمان لێدەکات، تەڵەکەمان لەناوەوە بۆ نراوەتەوە، مەترسی



لەناوخۆماندایەو خۆی لێ حەشارداوین، دوژمن لەناوەوە هەڕەشەمان لێدەکات. دەبێت لەگەڵ شێتیو خیانەتو خۆشگوزەرانیخوازیدا ململانێو جەنگ بکەین، لەم جەنگەی کەلەجۆری خۆیدا بێ وێنەیە من رێپیشاندەریو رابەری ئێوە دەگرمە ئەستۆ. بەڵێ خەڵکینە، سنگی خۆم دەکەم بەقەڵغانی تیری خیانەتکاران، و ئەو برینانە چارەسەر دەکەم کەپێدەچێت سارێژ بکرێن. بەڵام ئەو ئەندامە گەندەڵانەی دەبنەهۆی سەرنگونی وڵات دەبڕمەوە، ئەمانە دەبێت سەری خۆیان هەڵگرنو لەشار بڕۆنە دەرەوە، یان دەبێت دەست لەکاری رابووردوویان هەڵبگرنو ئەگەر هیچ کامیان بەوە قایلنین بادانیشنو چاوەڕوانی چارەنووسێك بکەن کە شایانیانە. بەڵام کەسانێك هەن دەڵێن گوایە من کاتلینام بەپێی بڕیارو فەرمانێکی زاڵمانە دوورخستۆتەوە گەر قسەی من بۆ دوورخستنەوە بەسبوو، ئەوا هەموو ئەو کەسانەی ئەوقسانە دەکەن دوورم دەخستنەوە. کاتلینا تا ئەم رادەیە گوێڕایەڵ نییە کەبەقسەیەکی کۆنسول ملکەچبێو رێگای تاراوگە بگرێت.

هاوڵاتییان؛ دوێنێ دوای ئەوەی لەماڵەکەی خۆمدا دەیانویست بمکوژن تیرەکانیان سەری دا لەبەرد بانگهێشتی سەناتۆرەکانم کردو لەپەرستگای "ژۆپیتێری ئەستاتۆر" کۆبوونەوەیەکمان سازداو ئەو پیلانەم بۆ تاوتوێکردن کەرۆژ بەرۆژ درێژە دەکێشێو پەرەیپێدەدرێ. کاتێك کاتلینا هاتە ناو کۆبوونەوەکە، ئێوە لەو باوەڕەدان کەسەناتۆرێك سەلامی لەو کردبێت وە یان لەگەڵ ئەودا وشەکی وتبێت؟ هەموویان بەچاوی دوژمنو رقەوە سەیریان دەکرد. چیتان پێبڵێم، چاکترینو بەرچاوترین سەناتۆرەکان لێی دورکەوتنەوەو کورسیەکانی دەوروبەریان چۆڵکرد، لەساتێکی وادا من بەم دەنگە

سامناکەمەوە (کەدەڵێن تەنها بەوشەیەکی, خەڵك بەرەو تاراوگە دەبا) پرسیارم لە کاتلیناکرد: ئایا راستە لەماڵی "لەکا" کۆبوونەوەی شەوانەتان کردووە؟ بەو هەموو بوێریەوە کەهەیەتی ویژدانی هانیدا بێدەنگ بێت ئەوسا هەرچیەکم دەزانی ئاشکرامکرد, وردەکاریەکانی وتوێژی شەوانەیانم باسکردو ئەو بڕیارانەی بۆ شەوی دواتر دەری کردبوو و نەخشەی ئەو کارانەی کەپێی هەڵدەسن, ئاشکرا کرد. کاتێك شڵەژاوی‌و سەرسامیم تیا بەدیکرد لێم پرسی: بۆچی بۆ ئەو شوێنەی کە ماوەیەکە بڕیارتدا داوە, ناڕۆیت؟ لەگەڵ ئەوەی کەششێرو ڕم‌و تەپڵ‌و ئاڵاو هەموو کەرەسەیەکی کارت تەنانەت ئەو هەڵۆ زیویەی کە (نەزرو نیازی کوشتن‌و ڕاووڕووتە) بۆ ئەو شوێنە ناردووە, ئیتر بۆچی دوودڵی لەڕۆیشتن؟ بەمجۆرە داخۆ دەکرێ بووترێت کەسێك کە دەیەوێت لەگەڵ کۆماردا بجەنگێت من ئەوکەسەم دوورخستۆتەوە؟ لەراستیدا "مالیۆس" بەفەرمانی ئەو لەقەراخ "فزولە[16]" دا بارو بنەی سوپاکەی هەڵداوەو جەنگی لەگەڵ میللەتدا دەستپێکردووە, ئەوان چاوەڕوانی کاتلینا دەکەن, کاتلینا سەرکردەی ئەوانە بەڵام کەسانێك پەیدا دەبن‌و دەڵێن, کاتلینا پەیوەندی بەو گروپانەوە نییەو ئەو بێچارەیە بۆ(مارسی) دووخراوەتەوە.

نەك بۆ بەردەوامبوونی دەوڵەت, بەڵکو بۆ رزگاری وڵات هەموو ئازارێك بەنرخی گیانم دەکڕم وادابنێن کاتلینا بەچاودێریکردنم‌و تەقەلاو فیداکارییەکانم دوچاری ترسبووەو دەیەوێ بڕیارەکەی بگۆڕێ‌و واز لەهاوڕێکانی بێنیٚ, دەست لەچەتەیی‌و شەڕەنگێزی هەڵبگرێت‌و واز لەڕقە بەرایەتی‌و جەنگ بێنێت‌و ڕێگای ئەو شوێنە

(16) شارێکبووە لەباکوری (ئاترۆری)و لەنزیك شاری (فلۆرەنسا) بووە.



دوورە بگرێتەبەر کەئێمە بۆمان دیاریکردووەو دووریدەخەینەوە. ئیدی کاتلینا لەبەرچاوی خەڵکدا ئەو شەڕخوازە نییە کەبەبۆنەی شەڕەنگێزییەکانیەوە گرتومە, ئەو خوێنمژە نییە کەهەوڵ‌و پڕکێشییەکانم ترساندبێتی, ئەو بەپیاوێکی بێتاوان دەزانن کە لەئەنجامی زوڵم‌و ستەمی کۆنسولێك بەبیٚ دادگایکردن دوورخراوەتەوە, چ جای ئەوەی کەسانێك لەبری نەفرەت کردن لەو پیاوە, بۆ نەهامەتیەکانی, بەداخەوەبن‌و لەبری دەستخۆشی‌و پێزانینی کارەکانم, بەستەم‌و دڵڕەقی تاوانبارم بکەن.

ئەی خەڵکی رۆما؛ سامناکترین زریانەکانی نەفرەت وەبەهێزترین دادوەرییەکان تەحەمول دەکەم بەمەرجێ بتوانم زریانی سامناك‌و نەفرەتئامێزی جەنگتان لێدوور بخەمەوە, لێگەڕێ با دوژمنان بڵێن من ئەوم بۆ تاراوگە ناردووە, بەڵام دڵنیابن کەئەو بۆ ئەو شوێنە ناڕوات‌و نایەوێت دوور بخرێتەوە, خودا بەشایەد دەگرم بوختان نییە, کاتلینا سەرکردایەتی گروپەکانی دەکات‌و هێرش دەهێنێتەسەر رۆماو دوای سیٚ رۆژیش هەواڵی هاتنی سوپاکەی دەبیستن. من زیاد لەوەی کەترس لەلێپرسینەوەتان دەربارەی دوورخستنەوەی دامبگرێت, دەترسم لێپرسینەوەم لەتەکدا بکەن کەبۆچی دەرفەتمدا بەکاتلینا لەڕۆما بچێتە دەرەوە. بەڵام ئەوانەی کەئەمڕۆ بەو رۆیشتنەی ناوی دوورخستنەوە دەبەن‌و دڵسۆزیی دەنوێنن, ئەگەر بمکوشتایە, چییان دەوت؟

ئەوان لافی ئەوە لێدەدەن کە کاتلینا دوورخراوەتەوە بۆ (مارسی)و نارەزایی توند دەردەبڕن وئەم نارەزاییە ریاکارانەیان بۆ شاردنەوەی نیەتی ناخی دڵیانە, ناتوانین هیچ یەك لەوکەسانەی کەنارەزاییان هەیە بدۆزینەوە, کە حەز نەکات کاتلینا پەیوەندی بەسوپاکەی

"ماليوس"ەوە نەكات, كاتليناش حەز ناكات ئەو قسانە دەربارەی بكرێت, ئەو پێشبينی شتێكی وای نەدەكردو ئارەزوومەندە وەك چەتەكان بكوژرێت نەك دووربخرێتەوە, كاتێك دنيا هەميشە بەئارەزووی ئەو بووە هەرچييەكی ويستوە ئەنجاميداوە. ئەمڕۆكە نەيتوانی بەو شێوەيەی ئارەزووی دەكرد, بمكوژێت. نابیٚ دڵسۆزی بنوێنن دەبێت هيواداربن دوچاری دوورخستنەوەيەكی راستو دژوار بێت.

پێويست ناكات هێندە دەربارەی دوژمنێك قسە بكەين, ئەويش ئەو دوژمنەی كەڕواڵەتی راستی خۆی نيشانداوەو هەروەك وتم ئارەزووم دەكرد كاتێك ديواریٚ من لەو جيابكاتەوە ئيتر هيچ مەترسييەكی نابێت. هەنووكەش كەسانێك هەن كەڕوخساری خۆيان لەژێر پەردەدا شاردۆتەوەو لەنێوانماندا ماونەتەوە, واتێمەگەن ئەوانمان فەرامۆشكردووە. ئەی خەڵكی رۆم؛ راستييەك هەيە دەمەویٚ بيخەمە بەر دەستتان, من ئەو دوژمنانەم دوور نەخستۆتەوە كەلەنێوماندان بەڵام تا بۆم بكریٚ پێمخۆشە لەبری سزادان ئەوان بخەمە سەر رێگەی راستو لەگەڵ نيشتماندا ئاشتيان بكەمەوە. ئەگەر ئەوان بەقسەيان كردم دەتوانن لەم رووەوە سەركەوتن بەدەست بهێنن.

هاوڵاتيان؛ هەنووكە بۆتان روونەدەكەمەوە كەئەوانە لە چ چينێكن. ئەوسا هەوڵئەدەم هۆكاری سەرەكیو بزوێنەری واقعی خيانەتی هەركام لەم چينانەتان بۆ باسو تاوتویٚ بكەم و بەچەكی لۆژيكو قسە بەرەنگارييان ببمەوە!!!

چينی يەكەمی خائينەكان؛ ئەوكەسانەن كەقەرزێكی زۆريان لەسەرە (هەڵبەتە ماڵو سامانێكی زۆريان هەيە) بەڵام شەهامەتيان نييە كە لەماڵو سامانەكەيان چاوپۆشی بكەنو رێگايەكی تر بۆ



دانەوەی قەرزەكانيان نادۆزنەوە. ئەوانە بەڕواڵەت كەسايەتيی ناسراوو بەرچاون, بەڵام لەڕاستيدا ئەو لافلێدانی ناوبانگەيان لەگاڵتەجاڕی زياتر شتێكی ديكە نييە, سەير ئەوەيە كەموڵكو كۆشكو تەلارو دەفری زێڕينو زيوو غولامی زۆرو هەموو شتێكيان هەيە, بەڵام ئامادە نين بەشێك لەوانە بفرۆشنو قەرزەكانيان بدەنەوە, كەواتە چاوەڕێی چی دەكەن؟ جەنگ؟ وادەزانن لەڕاوو روتێكی گشتيدا موڵكو ماڵو كێڵگەكانتان پارێزراو دەبێت؟ چاوەڕوانن كەقەرزەكانتان بدرێتەوە؟ ئەو كارانە لەكاتلينا ناوەشێتەوە؟ ئەوە منم دەتوانم بەشێك لەسامانو موڵكو ماڵتان بفرۆشمو قەرزەكانتان پیٚ بدەمەوە.

جيا لەمەش رێگايەكی دی نييە بۆ پاراستنی داراييەكانتان, ئەگەر لەبری ئەوەی كەهەموو ساڵێك داهاتەكەتان بەخاوەن قەرزەكان بدەنەوە, زووتر بڕيارتان دەداو قەرزەكانتان دەدايەوە, ئەمڕۆ هەم سامانێكی زۆرتان دەبوو, هەم بۆ نيشتمانيش رۆڵەيەكی باشتر دەبوون. هەڵبەتە ئەم چينە مەترسييەكی زۆريان بۆ نيشتمان نييە, ئەوان دەگەڕێنەوە بۆسەر رێگەی راستو ئەگەر نەشگەڕێنەوە زيانمان پێناگات لەبەرئەوە مومكينە بيرێكی خراپ لەوانەوە تێپەڕێت, بەڵام هيچ كارێكيان پێناكرێت, ئەوانە كەسانێك نين كەدەستيان بەچەك ئاشنا بكەن.

چينی دووەم؛ تاقمێكی هەڵشكاوو قەرزارن كەخولياى بەدەستهێنانی دەسەڵاتيان لەسەردايە, ئەوانە دەيانەویٚ بەهەر نرخێك بیٚ دەسەڵات بگرنە دەستو حكومەت بكەن. ئاشكرايە تا ئەوكاتەی ئارامیو ئاسايشی كۆمار بەردەوامبیٚ ئومێدی سەركەوتنيان نييە. بەمهۆيەوە بۆ بەدەستهێنانی دەسەڵات بەدوای ئاژاوەدا دەگەڕێن.

ئامۆژگاریم بۆ ئەوان هەرئەوەیە کە وتومە: دەبێ دەست لەخەیاڵی خاویان هەڵگرن چونکە لەمرێگایەوە بەئەنجامێك ناگەن, یەکەم بەربەستی رێی ئەوان بوونی منەو لەهەمووشوێنێکدا بۆ تێکدان‌و تێکشکاندنی پیلانەکەیان‌و بۆ رزگاری کۆمار ئامادە دەبم. لەخۆبوردوویی پیاوانی ئاشتیخوازو یەکێتی‌و زۆری ئەوان‌و هێزی سەربازیمان بەربەستگەلێکی پتەون لەبەرامبەر هەوەسەکانی ئەواندا‌و دواجار خوداکان کەپشتیوانی هەمیشەیی ئەم میللەتە نەدۆڕاوو ئەم ئیمپراتۆریەن کەشاژنی شارەکانی رووبەڕووی هەر پیلانێك کردۆتەوە, ئەم وڵاتە لەمەترسییەکانی ئەوان دەپارێزن‌و ئەوان کاتێك بەئارەزووەکانیان (کەوا شێتانە بەدوایدا دەڕۆن) دەگەن کەتەماشای خۆڵەمێشەکانی شاری رۆما بکەن کەبەخوێنی هەموو دانیشتوانەکەی شەڵاڵبووە تا تینوێتیان بشکێت. ئایا لەم وێرانە گەلەدا ئارەزووی حکومەت‌و دیکتاتۆری‌و سەڵتەنەت لەمێشکیاندا پەروەردە دەکەن؟ بەدوای دەسەڵاتێکدا دەڕۆن ئەگەر بەدەست بێت ناچار دەبێ تەسلیمی چەند غوڵامێك‌و چەند "گلادیاتۆر[17]"ێکی بکەن.

چینی سێهەم؛ ئەو کەسانەن لەتەمەنی پەککەوتەیی‌و پیریدان بەڵام لەئەنجامی مەشق‌و وەرزش‌و ژیانی دژواریان هێزو توانایەکیان تیاماوە. "مالیۆس" یەکێکە لەو کەسانە کەکاتلینا جێگەکەی دەگرێت, ئەوانە ئەو کەسانەن (سیلا) لە (فزول)دا کۆیکردبوونەوە, خەڵکانێکن بەچاکەکاری‌و باوەڕداری ناوبانگیان دەرکردووە,

(17) گلادیاتۆر: ئەو کۆیلە بەهێزانە بوون کەلەیاریگاری حوکمڕانەکانی رۆمای دێرین, وەرزش‌و مەشقی جەنگیان دەکردو بەفەرمانی حوکمڕانەکان لەبەرچاوی کۆمەڵگە تا رادەی کوشتن لەو یاریگایەدا شەڕیاندەکرد –وەرگێڕ–



رابردوویان حیکایەت لەدلێری‌و بوێری‌و ئازایەتیەکی زۆر دەکات, لەنێوانیاندا کەسانێك هەن کەژیانی رازاوەی چینی خانەدانیان هەڵبژاردو سامانەکانیان بەشێوەی دێوانە ئاسا خەرجەدەکرد. ئەوانە هەوەسی خاوەندارێتی موڵك‌و خزمەتکاران‌و غوڵامان‌و داخستنی سفرە رەنگینەکان‌و ژیانێکی رازاوەیان لەخەیاڵدابوو, ئاکامیان ئەوەبوو کە هەوەسەکانیان هەڵدێرێکی قوڵی خستە بەردەمیان‌و بۆڕزگاربوونیان لەو هەڵدێرەش لە بیری تازەکردنەوەی رۆژگاری "سیلا"دان. ئەم چینە بەم ئومێدەوە کۆمەڵێك خەڵکی گوندەکانیان لەگەڵ خۆیان دەکرد بەشەریك, ئەو گوندنشینانە کە وایاندەزانی تازەکردنەوەی رۆژگاری راووڕووت کۆتایی بەهەژاری‌و نەهامەتیەکانیان دەهێنێت. ئەم چینە جگە لە راووڕووت‌و چەتەیی مەبەستێکی دیکەیان نی‌یە, ئامۆژگاریم بۆ ئەم چینە ئەمەیە کە دەست لەو خەیاڵانە بەربدەن کە وڕێنەی پێوە دەکەن‌و ئارەزووی گەڕانەوەی دیکتاتۆرو زۆردارەکان دەکەن, رۆژگاری دیکتاتۆرەکان یادەوەرییەکی وەها سامناکیان بەجێهێشتووە کە نەك تەنها مرۆڤەکان بەڵکو ئاژەڵەکانیش ئامادەنین تەحەمولیان بکەن.

چینی چوارەم؛ کەسانێکی ئاژەوەچی‌و سەرگەردانن کە لە ئەنجامی بێکاری‌و لەش پەروەری‌و خۆش گوزەرانی‌و زیادەڕەوی‌و ویلخەرجی‌یەوە قەرزێکی زۆریان لەسەر کەڵەکە بووە. گوشاری خاوەن قەرزەکان قورسایی خستووەتە سەرشانیان‌و هەر رۆژ لەو زەلکاوەدا کە بەسەری دەبەن زیاتر رۆدەچن, رێگای دەربازبوونیان لەهەموو لایەکەوە لەسەر داخراوە, هەموورۆژێك رادەکێشرێن بۆ دادگاو هەموو رۆژ لە بەندکردن‌و حوکمدان بێزاربوون. لەشاردەربازبوون‌و پەنایان بردۆتە ژێر ئالای یاخی بوون تا بەڵکو کەلێنێك بدۆزنەوە, ئەوانە





سەربازانێکی ترسنۆکو چەند هەڵهاتوویەکی بێئەرزشن, لەهەمبەر یاساو دادپەروەریدا ڕادەپەڕن, بەڵام تواناى وەستانیان نییە. شکستو لەناوچوونیان یەکجاریەو خۆشیان ئەوەباش دەزانن, بەڵام نازانم بۆچی نەیان وویستووە بە شێوەیەك کۆتایی بە ژیانیان بهێنن کە نەکۆمارەکەمانو تەنانەت دراوسێکانیشیان لێی ئاگادارنەبنو, نازانم بۆچی ئێستا کە لەژیانی شەرافەتمەندانە بێبەشن و پەنایان بردۆتە بەرشەرمەزاریو, بۆچی مەرگی بەکۆمەڵ لەمەرگی تەنهایی بە ئاسانتر دەزانن؟

چینی پێنجەم؛ ئەو بکوژو تاوانبارانەن دەستیان بەخوێنی باوکی خۆیان شەلاڵ بووە, بەهیچ جۆرێك لەبیری جیاکردنەوەی ئەوانە نیم لەکاتلینا, ئەوانە کەسانی متمانە پێکراوی کاتلینان, ئەوانە لەبۆنو بەرامەی عەترەچاکەکانو قژی شانەکراویانو ڕیشە تاشراوەکانیان (یان ئەگەر ڕیشیان هەبێت لەوهونەرەی کە بۆ ئارایشتکردنی ریشیان بەکاری دەبەن) لەقژە درێژەکانی پشت سەریان, لەسەرقۆڵی جلوبەرگەکەیان کە دەستە ژنانیەکەیانی داپۆشیوە, دواجار دەکرێ لە شێوازی جلوبەرگو ئەوقوماشە ناسکانەیکە لەبەریاندایە بناسرێنەوە, ئەوان لە شەونخوونی ماندوونابنو بۆ بێداری شەوان تاقەتێکی زۆریان هەیە, قوماربازو شەڕانگێزەکانو ئەوانەش کە لە ژیانیاندا عەیبو شەرمەزاری ناناسن ئەم تاقمە پێکدەهێنن ئەوانە ناسکیو قەشەنگیەکی تایبەت بەخۆیان هەیەو هیچ هونەرێك جگە لە سەماو گۆرانی نازانن, جگە لە ئەوینو ئەویندارببوون هیچ کارێکی تریان لێنایەت, ئەگەر پێویست بکات دەست بۆ خەنجەر دەبەنو زەهر دەکەنە ناو کاسەوە. دڵنیابن تا ئەوانە زیندووبن ئەگەر لەشارا بمێننەوەو لەنێوان ئێمەدابنو نەڕۆن دەبنە "نەونەمامی" کە لە



درەختێکی کۆنە ساڵ جێمابێت. ئەوانە دوای کاتلینا هەڕەشە لە کۆمار دەکەن, بەڵام ئەو شتەی کە تێناگەم ئەوەیە ئەو بەدبەختانە چ ئارەزوویەکیان لە کەللەدایەو چۆن دەیانەوێت سەرماو دژواریەکانی چیاکانی "ئاپینۆن" تەحەمول بکەن. لەوەدەچێت وابزانن لەبەرامبەر سەختیو دژواریەکانی سەرمادا, ئەو ئەزمونانەی کە لەشەونخونیەوە فێربوونو ئەو هونەرەی لەسەماو گۆرانییەوە فێری بوون بەکار دێت. جەنگێکی سەیرە کە سەرکردەکانیان لەگەڵ ئەو جۆرە کەسانەدا بەرەو گۆڕەپانی شەڕ دەڕۆن.

ئەی خەڵکی ڕۆم؛ ئێستا کاتی ئەوەیە دەسەڵاتی ئێوەو ئیمپراتۆری لەبەرامبەر دەستدرێژییەکانی کاتلینادا ڕاپەڕن, دەبێت سەردارو کۆنسولەکانمان دژ بەو گلادیاتۆرانەی کە ناسۆری ئێمەیان پێوەیە ڕەوانە بکەین, دەبێت بۆ سەر کوتکردنی ئەو خەڵکە خراپەو ئەم پاشماوانەی کۆمەڵگا, جەنگاوەرە دەستە بژێرەکانو خونچە تازەکانی ئیتالیا ڕەوانە بکەین. بەدڵنیاییەوە کۆمەڵگای ئێمەو دەسەڵاتی بنەما گەلی میللیمان لەناوچە شاخاویەکانو دارستانەکانی کە بونەتە پەناگای شەڕەنگێزەکان هێزێکی زیاتریان هەیە. نامەوێت سەرچاوەی دەسەڵاتو گەورەیی ئیمپراتۆری لەگەڵ خراپەو ئالودەییەکانی ئەم تاقمە بێئابڕوە بەراورد بکەم, ئەنجومەنی پیرانو هێزی جەنگاوەرەکانو خەڵکی شارەکانو خەزێنەی ئابووریو ئیمپراتۆریو سەرچاوەی داهاتی زۆری وڵاتی ئیتالیاو ولایەتەکان و دەوڵەتەکانی دەرەوەو هەموو ئەوهێزانەی کە هاریکاریمان دەکەنو دوژمن سەرکوت دەکەن, دەخەینە لاوەو ئەو دوو ئامانجەش بەراورد دەکەین کە ڕوبەڕوی یەك دەبنەوە, ئەم بەراوردکاریەمان سوکایەتییەك

دەسەلمێنێت کە شایستەی ئەمجۆرە دوژمنە لاوازانەیە. ئەوشەڕەی دەستی پێکردووە شەڕێکە ململانێ لە نێوان ئابڕو و بێئابڕوویی، ئاکارو گەندەڵی، باوەڕداریو ڕژدی، خۆپاراستن لەتاوان لەگەڵ تاوان، شانازی لەگەڵ سەرشۆڕی، دەکاتو هەروەها زوهدو خراپترین شەهوەتەکان لەگەڵ یەکدا لەجەنگدان، دادپەروەریو تەقواو دلێریو هەموو چاکەکارییە مرۆییەکان لەبەرامبەر زوڵمو شەڕخوازیو یاخیبوونو خراپەکاریەکاندا خۆیان تۆکمە کردووە. لەکۆتاییدا جەنگێکە لە نێوان سامانو نیعمەت لەگەڵ بەدبەختیو نەداریدا دەستیپێکردووە. لۆژیكو عەقڵ لەگەڵ بێخەبەریو دێوانەیدا دژبەیەك وەستاون، ئومێدو نائومێدی لەگەڵ یەکدا لەململانێدان. لەم جەنگەدا کە لەنێوان دوو ئامانجو دوو مەبەستی جیاوازدا دەستییپێکردووە، داخۆ ئەوکەسانەی بەدوای حەقیقەتو ڕاستیدا دەڕۆن تێکدەشکێن؟ ئایا خواکان نابنە گەواهیدەری سەرکەوتنی تەقواو لەناوچوونی شەڕانگێزی؟

هەروەها ئێوەش چاودێری ماڵو شوێنی خۆتان بکەن، منیش ئاسایشی شار لە ئەستۆ دەگرم. دڵنیابن بەبێ ئەوەی بۆساتێکیش ئارامیتان تێکبچێت لەشارەکەمان بەرگری دەکەمو دەیپارێزم. هەموو هێزەکانمانو شارەکانمان لە ڕۆیشتنی شەوانەی ئەو چەتەیە "مەبەست لە کاتلینایە- وەرگێڕ"ئاگادارکردۆتەوە. لەهەموو شوێنێکدا خەڵکی لە شارەکانو سەرزەمینی خۆیان پارێزگاری دەکەن. کاتلینا وایدەزانی لەنێوان گلادیاتۆرەکاندا کەسانێکی باوەڕپێکراوو زۆربەی گروپەکانی خۆی بەدەست دەهێنێت. هەرچەند





گلادیاتۆرەکان لەهەندێ خانەدانەکان، خانەدانترن. لەگەڵ ئەوەشدا من لە پێشبینیەکی پێشوەختدا کە ڕووداوەکان ڕاستی ئەوە دەسەلمێنن ڕێگام لە ناردنی"مەتالۆس" بۆ "پیسنۆم"و "گۆل سیزئالپین" گرتووە، ئەوان تێك دەشکێنرێنو ئەوەندە گۆڕەپانەکەیان لێتەنگ دەکرێت کە دەرفەتی بچوکترین جوڵەیان نابێت. بەمەبەستی دەرکردنی بڕیارو دەرچوونی دەستورگەلی پێویست، خوازیاری ڕاوبۆچوونو بیروڕاکانی ئەنجومەنی پیرانمو، هەروەك دەزانن پێشەکی پێکهاتنی "ئەنجومەنی پیران" ئامادەکراوە هەنوکەش کاتی ئەوە هاتووە سەرقاڵی بارودۆخی ئەوکەسانە بین کە لەڕۆمادا مانەوە، یان بەزمانێکی دی ئەو کەسانەی لەلایەن کاتلیناوە پێیان ڕاگەیاندراوە لە ڕۆما بمێننەوە تا ئێوەو ڕۆما لەناوببەن. گومانی تیا نییە ئەوان دوژمنی ئێمەن، بەڵام نابێت ئەوە لەبیربکەین ئەوان هاووڵاتیانی ئێمە بوون، هەر لەم ڕووەوە حەزدەکەم جارێکی دیکەش لێیان خۆشبم، ئەوان بەخششو سۆزی ئێمەیان بە بێتوانایی لەقەڵەم دەداو، من چاوەڕوانبووم ڕاستییەکان ئاشکرا بن، بەڵام زیاتر لەمە ناتوانم ئەو بەرپرسیاریەتیانە لەبەرچاو نەگرم کە پێم سپێردراوە، ناتوانم ئەوە لەبیر بکەم کە قسە لەسەر وڵاتەکەم دەکرێ، ناتوانم لەبیری بکەم کە "کۆنسولم"و چارەنووسی ژیانی هاووڵاتییەکانم لەدەستدایەو دەبێت لەپێناویدا گیانم بکەم بەقوربانی تا ئاسایشی ئەوان دابینبکرێت. بەمجۆرە جارێکی دیکە دووپاتی دەکەمەوە دەروازەکانی شار بەهیچ جۆرێك دانەخراون، ڕێگاکان کراوەن ئەگەر بیانەوێ دەتوانن خۆیان بگەیەننە هاوڕێکانیان بەڵام ئەوانەی دەیانەوێ لەشاردا بمێننەوە

پێیان ڕادەگەیەنم نەك تەنها بۆ كارێك كە لێیان ببینم، بەڵكو بچوكترین خەیاڵی خراپو نەخشەی زیانبار كە بەمێشكیاندا دێت، بچووكترین كار كەزیانی بۆ وڵات هەبێت، پیشانیان ئەدەم ڕۆما كۆنسوڵ گەلێكی هەیە كە چاودێری دەكەنو هۆشیارن، دادوەرگەلێكی هەیە فیداكارن، ئەنجومەنی پیرانێكی هەیە زۆر بەهێزە، بەندیخانەگەلێكی هەیە لەوێ باووباپیرانمان لەڕووی دادپەروەرییەوە بۆ سزادانی خیانەتە گەورەكان كەرەسەی ئەشكەنجەو هۆشیاركردنەوەیان دروستكردووە.

هاووڵاتیانی خۆشەویست؛ دەبینن هەموو ئەوكارە پێویستانە بەبێئەوەی "خولەكێك" ئارامیو ئاسایشتان تێكبدات، ئەنجام دەدرێت، گەورەترینو ترسناكترین جەنگی ماڵەوماڵو ناوخۆ كە لەبیری مرۆڤدایەو لە حاڵەتی دروستبووندایە، بەتەنها ڕێی لێدەگرمو بەبێ هەراوهوریا مەترسییەكەی لەناو دەبەم. هەروەها پێویست ناكات سەركردەكەتان ئەم جلوبەرگە "دادوەرییەی نیشانەی ئاشتیو سەفایە" دابكەنێت. ئەی خەڵكی ڕۆما؛ ئیدی قسەیەكم نییە گەر ئەوەی گوتمو ئەو ئامۆژگاریانەی پێمڕاگەیاندن پەسەندبكرێ، لەڕۆمادا هیچ تاوانبارێك بەوسزایەی شایستەیەتی، ناگات. بەڵام ئەگەر خائینەكان پەلكێشیبكەنو لە پیلانەكانیاندا بەردەوام بنو مەترسییەكان هەرەشە لە نیشتمان بكات كە ناچاربم ئەم ڕەوشە نەرمونیانەم فەرامۆشكەم، ئەوا ڕەفتارێكم لێدەبینن كە ترسو هۆڤێتی ئەم ڕەوشەم لە هیچ جەنگێكی ترسناكدا (كەشەركەرەكانی لەهەر لایەكەوە لەمەترسیدان) وێنانەكرابێت، ئاشكرایە هیچ بێتاوانێك





ئازارنادرێت، بەڵام ئەشكەنجەدانی چەند كەسێكی خاینو تاوانبار بەسە بۆئەوەی وڵاتێك لە خاپووربوون ڕزگاری ببێت.

هاووڵاتیانی خۆشەویست؛ هەر ئەو بەڵێنەی كە دەیدەم دەرئەنجامی خۆپارێزیم، یان بەهۆی تەگبیرو چارەسەركردنەكانی مرۆڤەوە نییە، بەڵكو ئەمكارە لەسەربنەمای هێزێكی گەورەو بەنرخی دیكەیە، ئەمە ئەو خوداگەورانەن هەزارجار بەدەربڕینی لوتفەكانیان و یارمەتی دانی هەمیشەییان ڕێنماییان كردومو ئەمڕۆش ئیلهامم پێدەبەخشن. ماوەیەك خوداكان لە شەڕە دەرەكییەكاندا لە لوتفی خۆیان بەهرەمەندیان دەكردین. ئەمڕۆ شوێنی مەترسی گۆڕراوەو پەرستگاكانو میحرابی خوداكان دیواری ئەوشارەی كە ماڵەكانمانی لەخۆ گرتووە، جیلوەگای دەسەڵاتی خوداكانە. ئێوەش ئەی خەڵكینە دەستی نیاز بۆ ئەوان درێژبكەنو بۆ ئەوشارەش كە بەم قەشەنگییە دروستیان كردووەو دەوڵەمەندترینو بەهێزترینی شارەكانە لەبەرقاپی ئەواندا ڕازونیاز بكەن. داوا لە خوداكان بكەن دوای ئەو هەموو سەركەوتنانە كە لەدەرەوەی وڵات، لەدەریاكان، لەوشكاییەكاندا بەدەستمان هێناوە ئەم جارەش شارەكەمان ڕزگاربكات لەمەترسی پیلانو ئەودڵەڕاوكێیەی كە بەدەستی چەند خائینێك بۆمان دروستكراوە.

# وتاری سێهەم

**((ئەم وتارە رۆژی سێی دیسامبەر لەناوجەماوەردا پێشکەش کراوە))**

هاووڵاتیان؛ کۆمارو, گیانو ماڵتان, ژنانو منداڵانتانو, ئەم پایتەختە پڕشانازیەی کۆمارەکانو ئەم شارە قەشەنگو جوانە, هەموویان لە دەستی تاڵانی و سووتان ڕزگاریان بوو.

ڕاسپاردەی یەزدانە نەمرەکانو هەوڵو تەقەلاو چاودێریەکانم, ئەو هەڵدێرە سامناکەی کە خەریکبوو هەمووان لە ئارەزووە گڵاوەکانیا نغرۆ بکات, هەموار بوو و ئێوەش سەرکەوتن.

هاووڵاتیان؛ گەورەیی و کامەرانی ئەو رۆژەی مرۆڤ لە مردنی حەتمی ڕزگاری دەبێتو ژیان بەدەستدێنێت لەورۆژە زیاترە کە پێی ناوەتە ژیانەوە. ئەورۆژەی مرۆڤ پێدەخاتە ژیانەوە, بەخششەکانی ژیان ناناسێتو نازانێت لەکام هەلو مەرجدا نیعمەتی بوونو ژیانی پێدراوە, بەڵام کەسێك لەدەست مەرگ ڕزگاری بێت, ئەو نیعمەتو کامەرانییە دەناسێت کە پێیدراوەو لەچێژیشی بەهرەمەند دەبێت. کاتێك ڕۆما دروستکرا باووباپیرانمان لەرووی مافناسیەوە "ڕۆمۆلۆس"ی دامەزرێنەری"ڕۆما"یان لەپەرستگای خودا نەمرەکاندا, داناو ژیانی نەمریان پێبەخشی. ئێوەش ناوی ئەو دەسەڵاتدارەی کە پاش ئەوەی ڕۆما بەرفراوانترو جوانتربوو لەڕۆژگاری فەرمانڕەوایی



# وتاری سێهەم

ئەودا لەدەست پوچی ڕزگاریکرد, لەیادی مەکەن‌و بیرەوەریەکانی بۆ نەوەکانتان باسبکەن.

شاری ڕۆم لەبەردەم هەڕەشەی وێرانبوون‌و خاپوورکردندا بوو, بڵێسەکانی ئاگر لە پەرستگاکان‌و لەناو دیوارەکانی ماڵەکانتان بەرزەبووەوە, من توانیم بڵێسەکان بکوژێنمەوە, توانیم ئەو خەنجەرانەی بۆ وەشاندن‌و هاتنە خوارەوە بۆ سەر جەستەی کۆمار لە نێودەستی خائینەکاندا بوو وردی بکەم‌و ئەو شمشێرانەم لەکار خست کە بۆ گیانتان لەبۆسەدا بوون.

هاوولاتیان؛ ئێستا کە ئەم پیلانە دزێوە لە ئەنجامی چاودێرییەکانی مندا بەبەڵگەوە ئاشکرابوو لە کۆبوونەوەی "ئەنجومەنی پیران"یشدا وردەکارییەکانی ئەم پیلانەم خستە بەردەمیان بۆ لێکۆڵینەوە, دەمەوێ بەچەند وشەیەك بەسەرهاتەکەتان بۆ ڕوونبکەمەوە: ئێوە هێشتا لەگەورەیی ئەو پیلانەی لەئارادا بوو, ئاگادار نین‌و لەچیەتی ئەو ئامرازانەش کە بۆ دۆزینەوەی پیلانەکەو ڕایەڵەکانی بەکارمبردووە. هەنووکەش تینوێتیتان سەبارەت بەزانینی ڕاستییەکان دەشکێنم, هەموو دەزانن "کاتلینا" لەپاش ئەوەی چەند ڕۆژ لەمەوبەر کتوپڕ ڕۆمای بەجێهێشت, تاقمێك لە دلێرترین هاوکارو سەرکردەکانی بۆ ئەم جەنگە لەشاردا جێهێشتووە کە دژ بەنیشتمان دەستیپێکردووە. هەر لەوکاتەوە من بۆ ڕزگاری ئێوە بەبێ ئەوەی ساتێك غافڵبم چاودێری ئاشتی ڕیاکارانەو هەنگاوی خائینانەیانم کردووە.

کاتێك کاتلینام لەشارکردە دەرەوە "ئیتر لە دەربڕینی ئەم بابەتە کە کاتلینام لەشاردەرکرد, هیچ باکم نییەو تەنها لەوە دەترسم کە نەك ئێوە لەوەی ئەوم ئازاد کردووە بەخیانەت تاوانبارم بکەن"وە کاتێك بە





ڕەتاندنی ئەوەوە سەرقاڵ بوم, وامدەزانی لەپاش ڕۆیشتنی هاوکارەکانیشی بەدوی دەکەون‌و لێمان دووردەکەونەوە, خۆ ئەگەر چەند کەسێکیان لەشاردا بمێننەوە ناتوانن گروپێکی بەتواناو کاریگەر پێکبهێنن. بەڵام کاتێك لەپاش ڕۆیشتنی کاتلینا بینیم تاقمێك لەهاودەستەکانی زیاد لەوانی دی ڕەفتارو کردەوەکانیان نامەردانەیە, گومانم لێکردن, چونکە بەوپەڕی دزێوییەوە پەرەیان بەڕەفتاری خائینانەیان دەداو پانتایی و بەرفراوانی پیلانەکەیانم بۆ ڕونتر بووەوەو شەوو ڕۆژ سەرقاڵی چاودێریکردنیان بووم تا لەمەبەستو ئامانجەکەیان بگەم.

ئەگەر ئەو بەڵگە حاشا هەڵنەگرانەم بەدەست نەهێنایە هەرگیز باوەڕتان نەدەکرد کە چ پیلانێکی ترسناك داڕێژراوەو چ مەبەستێکی ناشیرین‌و شەرمهێنەریان لە خەیاڵدایە؟ بەڵێ دەمویست ئێوە بەچاوی خۆتان تاوانەکانیان ببینن تا گومان نەکەن لە قبوڵکردنی ئامۆژگاری‌و ئەنجامدانی ئەوشتەی کە پێویستە بۆ چاودێریکردن‌و, هەنوکەش سەرقاڵی بابەتە سەرەکییەکە دەبم‌و ڕووداوەکەتان بۆ دەگێڕمەوە:

ماوەیەك لەمەوبەر "لانتلۆس"[18] بەمەبەستی هاندانی "گلوا"و بەرپاکردنی شەڕ لەودیو "ئاڵپ"ەوە وتووێژێکی خائینانەی لەگەڵ

(18) لانتلۆس: لەساڵی 71ی پێش زایین پلەی "کۆنسول"ی بەدەستهێنابوو لەم کاتەدا پلەی "پەرتور"ی هەبوو. لەڕووی پلەوپایە پەرستییەوە لەگەڵ پیلانگێڕاندا بەشداریکردو هاوکاری کاتلینای دەکرد. پاش ئەوەی پەردە لەسەر پیلانەکە هەڵدرایەوە خرایە بەندیخانەو لەگەڵ "ستۆکۆس"و تاوانبارەکانی تردا لەبەندیخانە کوژران.

نوێنەرانی "ئالوبرۆژ"[19] دا دەست پێکردبوو. نوینەرەکانی ئالوبرۆژیش بەرەو "گۆل" دەچوونو نامەو هەندێ فەرمانیان پێبوو دەیانویست لەگەڵ "کاتلینا"دا قسە بکەن, "ڤۆلتۆریۆس"[20] لەگەڵ ئەو تاقمەدا بوو, دەبوایە ئەو نامانە بەسەرکردەی شەڕانگێزەکان بگەیەنێت. کاتێك لەم ڕووداوانە بەئاگابووم, دڵنیابووم ئەوشتەی هەمیشە خوازیاریبووم لەیەزدانە نەمرەکانو لەگەڵ ئەوەشدا کە گەورەترین خواستمە بەدیدێت, هەمیشە ئارەزووم دەکرد بەڵگەیەکی خاینەکانم بەردەست بکەوێتو پیشانی ئێوەو "ئەنجومەنی پیران"ی بدەم تا لە نهێنییەکانی پیلانەکە ئاگادار بن دوای بەئاگابوون لەم ڕووداوانە دوێنێ شەو "فلاکۆس"[21] و "پرپمیتۆس"[22](کە وەسفی

(19) ئالوبرۆژ: هۆزو قەبیلەیەکی گەورەبووەو لەنێوان "ڕن"و "ئایزەر" دادەنیشتن.

(20) ڤولتۆریۆس: پێی سپێردرابوو نوێنەرەکانی قەبیلەی ئالوبرۆژ بەکاتلینا بناسێنێت.

(21) فلاکۆس: بۆ ماوەیەك سەرکردایەتیو فەرمانڕەوایی ئاسیای بچووکی پێدرابوو. پاش ئەوە تاوانبار کراو شیشرۆن لەدادگا بوو بەپارێزەریو داکۆکی لێکردو بێتاوان دەریکرد.

(22) پۆپمتیۆس: نوێنەرایەتی شیشرۆنی لە سیسیل پێدرابوو (51–50 پێش زایین).



فیداکاریو ئازایەتییان ناکرێت) بۆ ماڵی خۆمان بانگهێشتکردو بەسەرهاتەکەم بۆ باسکردنو ئەونەخشەیەم بۆ ڕوونکردنەوە کە بۆ بەدەستهێنانی بەڵگەکان دامڕشتبوو, ئەم دوو دادوەرە شەریفە هەمیشە بۆ نیشتمان هەستێکی بەسۆزو بەرزیان دەربڕیوە, بەدڵ گەرمیەوە ئەو ئەرکەی پێمسپاردن قبوڵیان کردو لەکاتی شەودا بەنهێنی خۆیان گەیاندە سەر "پردی میلۆیۆس"[23] وەهەریەکە لەوان لەگوندێکی جیاواز مانەوە کە ئەو گوندانە لە هەردووبەری ڕووباری "تیبەرو پردی میلویۆرس"دابوو. ئەوان زۆر بەنهێنیو بێخۆ دەرخستن تاقمێك جەنگاوەریان لەتەکدا بوو وە تاقمێك لەلاوانی "ڕئات" کە هەمیشە ئامادەن بۆ ئەو شوێنەڕەوانە کردوو بەچەکی تەواوەوە خۆیان دامەزراند. لەدواچرکەساتەکانی پاسەوانی سێهەم[24] دا نوێنەرەکانی "ئالوبرۆژ"لەگەڵ تاقمێکی زۆردا دەرکەوتنو

(23) پردی میلۆیۆس: لەباکووری ڕۆمادا بوو. لەوشوێنەی کە جادەی "فلامنیا" لەسەر ڕووباری تیپەر تێدەپەڕێ.

(24) ڕۆمییەکان شەویان کردبوو بە چواربەشەوەو هەربەشە نزیکەی 3 کاتژمێر بوو کە لەسەرەتای شەوەوە تا هەتاو کەوتن بەنۆبە پاسەوانیان دەکرد. بەمەش ماوەی پاسەوانیەکە بەپێی وەرز لەگۆڕاندا بوو بەڵام لەهەموو حاڵەتێکدا پاسەوانی هەمیشە لەنیوەشەوەوە دەستیپێکردو کۆتاییەکەی کاتژمێری 3ی پاشنیوەشەوبووە جالێرەدا دەردەکەوێت کە لەدەوروبەری 3ی پاش نیوەشەو نوێنەرەکانی ئالوبرۆژ گەیشتبێتنە ئەوشوێنە





"فۆلتۆریۆس" یشیان لەتەکدا بوو, کاتێك گەیشتنە سەرپردەکە لە دوولاوە هێرشیان کرایە سەرو شمشێریان لێهەڵکێشان. تەنها ئەو دوو دادوەرە شەریفە بابەتە نهێنییەکان دەزانن و ئەوانی دی لەهیچ بەئاگا نەبوون.

شەڕ دەست پێدەکات, ئەوکاتەش کە "پۆپمینۆس"و "فلاکۆس" کۆتایی بەجەنگەکە دەهێنن, ئەوان هەموو نامەکان بەمۆرکراوی و بێکەموکوڕی تەسلیم دەکەن و نوێنەرەکان و ئەوانەش کە لەتەکیاندا بوون, دەستگیر دەکرێن و بەرەبەیانێکی زوو هێنایانن بۆ ماڵەکەم, فەرمانمدا کە "کابینیۆس سمبر" بهێنن بۆ لام کە بێشەرمترین ئامادەکەری ئەو پیلانە ترسناکە بوو, ئەو هێشتا لەڕووداوەکە بەئاگا نەبوو, بەدوای ئەودا "ساتیلیۆس"و "ستۆکۆس"و "لانتلۆس"م داواکرد, "لانتلوس" کەمێك درەنگتر لەوانی دی هات. بێگومان بەپێچەوانەی ڕۆژانی پێشوو ماوەیەك لەکاتی شەوی خۆی بۆ ڕێکخستنی نامەکان تەرخانکردبوو. بەبلاوبوونەوەی هەواڵەکە خەڵکێکی زۆر لە هاوولاتیە ناسراوەکان هەر ئەو بەیانییە لەماڵی ئێمە کۆبوونەوە. ئەوان داوایان دەکردو پێیان دادەگرت کە بەپەلە نامەکان بکەمەوە, لەوە دەترسان ئەگەر لە (ئەنجومەنی پیران)دا نامەکان بکرێنەوە پێدەچێت ناوەڕۆکی ئەونامانە ئەو بایەخەی نەبێت کە جێی سەرنجی ئەنجوومەنی پیران بێت و لەم ڕووەوە تەنها لەبەرئەوەی گوماندەکرێ مەترسی تیابێت بۆ سەرکۆمارەکەمان سەرزەنشت بکرێم. لەوەڵامی ئەم قسانەدا وتم, بابەتەکە پەیوەندی بە ئاسایشی گشتییەوە هەیەو شایانی ئەوەیە کە لەئەنجومەنی پیراندا بخرێتە ڕوو, هەروەها ناکرێ ئەمجۆرە مافانە لە ئەنجومەنی پیران بسەندرێتەوە.





هاوولاتیانی خۆشەویست؛ گریمان ناوەڕۆکی نامەکان ئەوەنەبێت کەمن دەیلێم, بەلام کاتێك بابەتی خاپورکردنی ولات لەئارادایە, ئایا شیاوبوو کە من لەترسی سەرزەنشت و لۆمەکردن ئارامبگرم لەبەر ئەوەی دووربینی و پارێزێکی زیاترم کردووە؟

هەروەك دەزانن زۆر بەپەلە ژمارەیەکی زۆری نوێنەرەکانم کۆکردەوە, بەپێی ئەو زانیاریانەی لە نوێنەرانی ئالوبرۆژ دەستمانکەوت, لەماڵی "ستۆگۆس" چەکێکی زۆر کۆکرابۆوە "سۆلپیسیۆس"ی دادوەرم (کە متمانەم پێدەکرد) نارد بۆ ماڵی "ستگۆس"تا چەکەکان کۆبکاتەوە, ئەو لەگەڵ خۆیدا ژمارەیەکی زۆر خەنجەرو شمشێری هێنا.

فۆلتریۆسم لە غیابی "گلوا"کاندا بانگکردو بەناوی کۆمارو ئەنجومەنی پیرانەوە دڵنیام کردەوە هەرچییەك دەزانێ بیلێت لەبەرامبەردا لەسزادان دەبەخشرێت. دوای ئەوەی بەسەر ترس و دڵەڕاوکێ بەراییەکەیدا زاڵبوو, وتی؛ نامەیەکی (لانتلۆس)ی پێبووە کە دەبوایە بیگەیەنێتە "کاتلینا"و بەپێی ئەوزانیاریانەی پێیان دابوو, ئەرکی پێسپێردرابوو سەرنجی کاتلینا بۆ غولام و کۆیلەکان ڕابکێشێ و هانیبدات بەهاوکاری لەگەڵ ئەواندا بەپەلە بەرەو ڕۆم بڕوات. لەونەخشەیەی پێیان بوو واپێشبینی کرابوو کە هاوکارەکانی کاتلینا هاوکات لەگەڵ نزیکبوونەوەی ئەودا لەدەروازەکانی ڕۆما. ئەوانیش لەناوشارەوە دەست بەکاربن و گەڕەکەکانی شار بشڵەژێنن و ئاگر لە خانووی هاوولاتییان بەربدەن و دەست بکەن بە کوشت و کوشتاری خەڵکی بێتاوان و لەهەرلایەکەوە ترس و دڵەڕاوکێ بخەنە دڵی دانیشتوانی شاری ڕۆماوەو هەرکەس بیەوێت هەڵبێت بیگرن. کاتلیناش لەڕۆمادا پەیوەندی بەهاوکارەکانیەوە دەکات. دوای

ئەوەش نۆبەی لێکۆڵینەوە بوو لەتەك "گلوا"کاندا, ئەوان دانیان پیانا لەلایەن "لانتلۆس"و "ستۆگۆس"و "ستانیلیۆس"ەوە پەیامو "سوێند نامە"یان پێسپێردرابوو کە بەگەلی "گۆل"ی بگەیەنن, هاوکات لەگەڵ "کاسیۆس" داوایان دەکرد تاقمێك سەربازی سوارە بۆ ڕۆما بنێرن.

وا پێدەچوو لەبەشی "سەربازی پیادە"دا هێزێکی زۆریان هەبێتو لەورووەشەوە پێویستیان بەیارمەتی نەبوو (لانتلۆس) ئەوانی بەپێی پێشبینی غەیبگۆیانو فاڵگرەوەکان ڕازیکردبوو. لەپاش "سیلا" و "سینا" قەدەروابوو ئەو ببێتە سێهەمین پیاوی دەسەلاَتدارو فەرمانڕەوای ڕۆما و دەوڵەتێکی ڕەها پێکبهێنێت. "لانتلۆس" پێی وتبوون ئەمساڵ (کە دەهەمین ساڵی ئازادی "راهیبەکان"و بیستەهەمین ساڵی ئاگرتێبەردانی "کاپیتۆل[25]"ە ڕەزاو خواستی خوداکان لەسەر وێرانکردنو خاپوورکردنی ڕۆمایەو کەس ناتوانێت ئەم چارەنووسە بگۆڕێ. "گلوا" کان وتیان, "ستۆکۆس"و تەواوی پیلانگێڕەکان تەنها لەسەر خاڵێك هاوڕا نەبوون, "لانتلۆس"و هاورێکانی لەو باوەڕەدابوون دەبێت پیلانو کۆمەڵکوژی لەڕۆژی جەژنی "ساتورنال"دا ئەنجامبدرێ, بەلاَم "ستۆگۆس" ئەو ڕۆژەی بەدرەنگ دەزانی.

بەکورتی ئەو نامانەی کەهەریەك لەو تاوانبارانە نووسیبویان پیشانمدانو "ستۆگۆس" یەکەم کەس بوو کە چاوی بەنامە مۆرکراوەکەی کەوت. دوای ئەوەی کەدەرکەوت مۆرەکەی ئەوەو

(25) "کاپیتۆل" جارێك لەساڵی "83 پ.ز" وە جارێکی دیکە لە ساڵی 69ی پ. ز ئاگری تێبەردرا.





پیشانمدا نامەکەم کردەوە کەبە "دەستو خەتی" خۆی نوسیبووی و پاشان خوێندمەوە, لەم نامەیەدا بەناونیشانی "ئالوبرۆژ" و " ئەنجومەنی پیرانی ئەوان" بوو, ستۆگۆس بەڵێنەکانی خۆی دووپاتکردەوەو سوێندی دەخوارد بەوەی لەڕێی نوێنەرەکانیەوە پەیمانی داوە بە وەفاداری دەمێنێتەوە داوای لێدەکردن ئەوانیش لەپەیمانەکانیان ژیواننەبنەوە. بەر لەکردنەوەی نامەکە "ستۆگۆس" لەوەلاَمی پرسیارەکەمدا کەلێم پرسی: "ئەو هەموو شمشێرو خەنجەرانەت بۆچی لەماڵەکەتدا کۆکردۆتەوە؟", وتی: من هەمیشە حەز بە کۆکردنەوەی چەکی باش دەکەمو هیچ مەبەستێکم لەکۆکردنەوەی ئەو چەکانەدا نەبووە, بەلاَم کاتێك نامەکەی ئەو خوێنرایەوە سەرشۆڕو شەرمەزاربوو, ویژدانی ناچاریکرد بەبێدەنگبوون.

دوای ئەو "ساتیلیۆس" بانگکراو دوای ئەوەی مۆرو واژۆکەی خۆی قبوڵکرد, نامەکەی خوێندرایەوە ناوەڕۆکی نامەکەی وەك نامەی پێشووی بوو, بێبەرگریکردن قسەی لەسەرهەموو شتێك کرد.

دواجار "لانتلۆس"م بانگکردو نامەکەیم پیشانداو لێمپرسی ئایا نامەکەت دەناسیتەوە؟ کاتێك قایلبوو نامەکەی خۆیەتی وتم: "لەڕاستیدا ناسینەوەی مۆرو نیشانەی ئەم نامەیە ئاسانە چونکە وێنەی باپیرت لەسەر مۆرەکەیەو ئەم وێنەیە پیاوێکە نیشتمانو هاونیشتمانیەکانی خۆشدەویستو لەگەڵ ئەو هەموو بێدەنگییەیدا کەهەیەتی ئەگەر بیتوانیایە پەشیمانیدەکردیتەوە لەو ڕێگایەی هەڵتبژاردووە, ناوەڕۆکی نامەکەی بۆ گەلی ئالوبرۆژو ئەنجومەنی پیران لەنامەکانی دیکەی دەچوو, لەپاش خوێندنەوەی نامەکە, ڕێم پێدا ئەگەر ڕونکردنەوەیەك بەپێویست دەزانیّ با بیلێت, سەرەتا

خەریکبوو نکوولّی لێدەکرد, بەلاّم کاتێك بەلّگەو نیشانەگەلێکم پیشاندا کەهاوکاری ئەویان دەسەلماند, لەجێی خۆی هەستاو پرسیاری لە (گلوا)کان کرد, کە داخۆ هیچ کات کارێکی بەوان هەبووە؟و ئەوان بۆ چ مەبەستێك بۆماڵی ئەو رۆیشتوون؟و لە "ڤۆلتۆریۆس"یش هەمان پرسیاری کرد, "گلوا"کان بەسادەیی‌و لەوپەڕی ئارامیدا وەلاّمیاندایەوەو ناوی ئەو کەسەیان وت کە چاوپێکەوتنەکانی بۆ رێکخستبوون‌و ئاماژەیان بەژمارەی چاوپێکەوتنەکان‌و وردەکاریەکانی کردو لەکۆتاییدا لە "لانتلۆس"یان پرسی, داخۆ ئەو دەربارەی "پێشبینی‌و کتێبی جادوگەران" قسەی لەتەك ئەواندا نەکردووە؟ بەبیستنی ئەو قسەیە دێوانەیی دەرهەق بەتاوانکردن لەمێشك چووە دەرەوەو ویژدانی دەرکەوت‌و لەبەرامبەر ئامادەبووندا قسەی لەسەر هەموو تاوانەکانی کرد.

لێرەوەیە کاریگەری سەرسوڕهێنەری هەقیقەت لای تاوانباران ئاشکرا دەبێت, کاتێك کەئیتر نائومێد بوو, رێگای دەربازبوونی لەهەموو لایەکەوە لێگیرا پەنای برد بۆ هێزی دەربڕینەکانی (قسەکانی) کەیەکێك بوو لەتایبەتمەندیەکانی. بەلاّم ئیتر تەنانەت ئەو توانای قسەکردن‌و پەلکێشی‌و بێشەرمیەی کەهاوتای نەبوو, کاریگەرییان نەمابوو, لەم کاتەدا "ڤۆلتۆریۆس" داوای کرد ئەو نامەیەی "لانتلۆس" بۆ "کاتلینا"ی نوسیووە (بۆخۆی هەڵگری ئەو نامەیە بووە) بخوێنێتەوە.

نامەکەم پێدا "لانتلۆس" لەتەك ئەو هەموو دڵەڕاوکێیەشدا حەقیقەتی نامەکەی سەلماند, نامەکە واژۆ نەکرابوو, ناوەڕۆکی ئەمەبوو "ئەو کەسەی کە دێت بۆلات نووسەری نامەکەت پێ دەناسێنێت, پیاوبەو لەوکارانەی کە کردووتەو ئەو کارانەشی





ئەتەوێت ئەنجامی بدەیت بیر بکەرەوە, هەوڵبدە لەهەموو شوێنێك هاوڕێ بۆخۆت بدۆزیتەوە تەنانەت دەبێت لەنێوان خراپترین چیندا هاوکار بۆخۆت بدۆزیتەوە". نۆبەی "کابینۆس" هات, سەرەتا بەوپەڕی بێشەرمییەوە نکوڵیدەکرد بەلاّم دواجار قایلبوو بەوشتانەی کە "گلوا"کان دەرهەق بەو دەیانووت‌و دانییانان.

هاولاّتیان؛ بەلّگەو شایەتە حاشا هەڵنەگرەکانی تاوانەکە, نامەکان, دەست‌و خەت‌و واژۆی تاوانباران, دانپیانانی ئاشکرای ئەوانم بۆ باسکردن, بەلاّم من بەچاوی خۆم بەلّگەگەلێکی توندترو پتەوترم بەچاوی خۆم بینی, رەنگپەڕینی روخساریان, نیگاو شێوەی دەموچاویان, بێدەنگی‌و تەسلیم بوونیان, سەرسامبوون‌و واقوڕمانیان, سەرشۆڕی‌و ئەو چاوانەی کەبڕیبوویانە زەوی, ئەو نیگایانەی کەلەگەڵ یەکدا دەیان گۆڕییەوە ئەمانە هەموو بەلّگە گەلێکی پتەوی دیکەبوون کەبەبینینیان بەباشی بۆمان دەردەکەوێت کەئەوانە تاوانبارێك نین تۆمەتیان بۆ دروستکرابێت بەلّکو ئەو تاوانبارانەن کەدانیان بەتاوانەکانیاندا ناوە.

هاولاّتیان؛ ئێستاکە سەرکردە خائینەکانی ئەم جەنگە شەرمەزارو ماڵ وێرانکەرەتان خزاندۆتە زیندانەوە, دەکرێ کاتلینا بەدۆڕاو و شکست خواردوو بزانن. بەلّێ بە رزگاریکردنی شار (رۆما) هێزەکانی تیاچوو, ئاواتەکانیشی نەهاتەدی.

کاتێك کاتلینام لەڕۆما کردە دەرەوە دڵنیابووم لەپاش رۆیشتنی "لانتلۆس" بەو پشتە کۆمەیەوەو "کاسیۆس" بەو بیروهۆشە کەمەیەوەو "ستۆگۆس" بەو بوێریەی هەیەتی, هیچ کارێکیان پێناکرێت, ئەو مەترسیەی هەڕەشەی لێدەکردین تەنها لەلایەن کاتلیناوە بوو, تا ئەوکاتە مەترسی هەبوو کەئەو هێشتا لەڕۆمادا بوو,

ئەو لەگەڵ هەموو کەسێکدا ئاشنایەتی هەبوو, ئەگەر بیویستایە ئاگایی لەکارێك بێت, یان داوای چاوپێکەوتنی بەمەبەستی دیدارو وەرگرتنی زانیاری لەهەرکەسێك بکردایە لەهەر پلەو پایەیەکدا, بەئاسانی ئەوکارەی بۆ دەچووە سەرو پڕکێشی بۆ هەر چاوپێکەوتنێك دەکردو بۆ ئەنجامدانی تاوانیش کەسێکی بلیمەت بوو, کاتێك بڕیاری تاوانێکی دەدا چ بەتوانایی جەستەیی‌و چ بەتوانایی قسەکردن پاساوی بۆ ئەو تاوانە دەهێنایەوە هاوکارەکانی فیداکارییان بۆ دەکردو ڕۆڵی خۆیانیان دەزانی, کاتلینا کەسێك نەبوو کەتەنها بەدەرکردنی فەرمان قەناعەت بکات بەڵکو خۆی چاودێری فەرمانەکانی دەکرد, لەهەموو شوێنێك ئامادەبوو و چاودێری هەموو کارەکانی دەکرد,و دەیتوانی تەحەمولی سەختی‌و دژواریەکان بکات, ماندوێتی, برسێتی, تینووێتی, سەرما, کاریان لێنەدەکرد. ئەو پیاوە پڕکارو بوێرو فێڵبازە کە لەتاواندا ماندویەتی نەدەناسی ئەگەر ئەو توانایەی هەبوایە فەرمانبداو کارەکان ڕێکبخات‌و تەنانەت لەئاژاوەو ئاشوبەکاندا ڕێبەری خۆی بپاراستایە لەڕۆما دور نەدەکەوتەوەو بەناچاری ئەو جەنگە نهێنیەی لەڕۆما دەستیپێکرد نەیدەگۆڕی بەجەنگێکی یاخیانەی ئاشکرا. بیٚ باکانە دەبێت بڵێم توانام نەبوو ئەو زریانە ترسناکەتان لێدوربخەمەوە کەهەڕەشەی لێدەکردن. کاتلینا هەرگیز وەك هاوکارەکانی ئێوەی تا جەژنی "ساتوڕناڵ" لەچاوەڕوانیدا نەدەهێشتەوە, هەرگیز ئەو ڕۆژەی ڕانەدەگەیاند کەبۆ وێرانکردنی کۆمار لەبەرچاویگرتبوو, ناچار نەبوو نامەو ئەو واژوانەی کەهەنوکە بەڵگەگەلێکی حاشا هەڵنەگرن, بخاتەبەر دەستتان. دەرئەنجام دورکەوتنەوەو ڕۆیشتنی ئەوبوو کە ئەمڕۆ بەڵگەی پیلانە ترسناکەکانیمان دژ بەکۆمار لەبەردەستدایەو





بەبەڵگەشەوە وەك ئەو دزەی لەکاتی دزیکردندا دەگیریٚ, خیانەتەکەی دەسەلمێنین. گومانی تیا نییە تا ئەوکاتەی ئەو لەڕۆما بوو هەمیشە پیلانەکانیم پوچەڵ دەکردەوە, بەڵام ئەگەر تا ئێستا لەڕۆمادا بمایە,و بمویستایە خۆم بەدور بگرم لەدیمەنی ترسناکی ئەو شتەی چاوەڕوانیمان دەکرد, دەبێت بڵێم جەنگێکی قورس چاوەڕیٚی دەکردین‌و, ئەگەر دوژمنیش لەحەسارەکانی شاردا نیشتەجێبووایە, بەبیٚ تێکدانی ئاسایشتان‌و بەبیٚ ئاژاوەنانەوەو ئاشوب, وڵاتەکەمان (ڕۆما) لەم مەترسیە ترسناکە ڕزگاری نەدەبوو.

هاوڵاتیان؛ بەدڵنیاییەوە لەو ڕووداوە دژوارەی کەبەسەرچوو, من کاربەدەستێکی بچووك بووم بۆ ئەنجامدانی ئیلهامی یەزدانە نەمرەکان, حیکمەت‌و سەروەری خوداکان بوو کەپێشبینی هەموو شتێکیان کردبوو, و ڕێنمایی منیشیان دەکرد, هێندە بەسە ئەوە لەبەرچاو بگرین کەبۆ بەدەستهێنانی ئیمان‌و باوەڕ, ڕێبەرایەتیکردنی ئەو گۆڕانکاریانەی دوایی تا چ ڕادەیەك لەسەرو تەگبیرو تواناکانی مرۆڤەوە بووە. پشتیوانی خواکان هێندە ئاشکراو ڕوندەبینرێت کە لەدیدی هیچ کەسێکدا وننابێت. بەبیٚ ئەوەی بمەوێت لەو ڕۆشناییە ترسناکانەی خۆرئاوا کەتاریکی دەدڕی‌و بڵێسەی دەسەندو ئەو هەورە بروسکانەی یەك لەدوای یەك دەهاتنە خوارەوەو ئەم زەویەی ژێر پێی ئێمەی دەلەرزاند,و هەزاران پەرجوی دیکە کە لەساڵی ڕابوردوودا دەنگی ئاسمانیان بەگوێمان دەگەیاند,و ئەم ڕووداوانەش کەباسیان دەکەم شایستەی تێڕامانن. لەیادتانە لەسەردەمانی کونسولای (تورکاتوس) و (کوتا) بەهۆی هەورە بروسکەوە بەشێك لە "کاپیتۆل" زیانی بەرکەوت لەئەنجامدا یەزدانە نەمرەکان پەرتەوازەبوون‌و پەیکەری قارەمانە دێرینەکان سەرنگونبوون‌و

لەوحەی نەخشێنراوی یاساکان توانەوەو رۆمۆلۆسی پیرۆز دامەزرێنەری رۆما, لەدەفرێکی زێریندا وێنەی لەشێوەی منداڵێکدا کێشرابوو کەدەمی بۆ گوانی گورگێك کردبۆوەو, تەواوی ئەوانەتان لەکاپیتۆل بینیوە, کەزیانی بەرکەوتووە. ئەو رۆژانە غەیبگۆکان لەناوچە جیاوازەکانی (ئاترۆری)دا کۆبونەوەو رایانگەیاند ئەو رۆژگارە دور نییە کە کوشتارو راوو رووت و ئاگرتێبەردان و سوکایەتیکردن بەیاساکان و جەنگی ماڵەو ماڵ ئیمپراتۆری رۆما بەرەو بێهودەیی ببات و هیچ رێگا چارەیەکیش جگە لەبەدەستهێنانی رەحم و بەزەیی خوداکانمان لەبەردەمدا نییە, تا بەڵکو تواناو دەسەڵاتی خوداکان بەسەر چارەنوسی فەرمانڕەوادا زاڵ بێت و لەو مەترسیە بەدورمان بگرێت.بەپێی ئامۆژگاری ئەوان ئاهەنگی سەرکەوتنەکان دەرۆژ بەردەوامبوو خەڵکیش بۆ بەدەستهێنانی "رەحم و بەزەیی خوداکان" هیچ کەمتەرخەمیەکیان نەکرد.

هەروەها غەیبگۆکان, پێشنیاریان کرد پەیکەرێکی گەورەتر لەئۆڵەمپ دروست بکەن بەرەو رۆژهەڵات بێت, غەیب بێژەکان لەو باوەڕەدابوون کاتێك پەیکەری پیرۆز (کەئێستا لەبەردەمی ئێوەدایە) بەرەو رۆژهەڵات بێت کەخۆر بەیانیان لەوێوە هەڵدێت و تەماشای ئەنجومەنی پیران و رۆما بکات, تاروپۆی هەرپیلان و خیانەتێك دەپسێنێت کەبۆسەرنگونی کۆمار لەتاریکی شەودا بتەنرێت و بۆ خەڵکی و ئەنجومەنی پیرانیش ئاشکرای دەکات.

کۆنسولەکان بەپەلە هەوڵیاندا پەیکەرێکی تازە دروست بکەن بەڵام هێندە لەسەرخۆ دروستیانکرد کەلەسەردەمی پێشینانماندا بناغەکەی تەواو نەبوو, تا ئەمرۆش هەوڵ و تەقەلا بەردەوام بوو تا لەکۆتایدا پەیکەرەکە لەجێی خۆی دانرا.





هاوڵاتیان, لەگەڵ ئەمەشدا ئایا مومکینە کەسێك تا ئەم رادەیە دژایەتی حەقیقەت بکات و ئەوەندە لەزەلکاوی نەزانیدا رۆبچێت و ئەوەندە کوێر دڵ بێت نکوڵیبکات لەوەی ئەم جیهانەو بەتایبەتی شاری رۆما, لەژێر رەزاو رەحمەت و پەنای خودا نەمرەکاندا نیە؟

لەڕاستیدا دەرئەنجامی ئیلهامی خوداکان بوو کەنیەت و مەبەستی خائینەکان و ئەو پیلانانەی بۆ کوشتار, سوتاندن و خاپورکردنی رۆما دایانڕشتبوو, ئاشکرابوو, ئەو خیانەتانەی کەبەهۆی گەورەیی و خۆ بەزلزانینی کەسانێکەوە کەحاشایان لێدەکرد, ئەمرۆ لەبەرامبەر ئێوەدا راستی لەخۆ دەگرێت و دەرکەوت نەك تەنها خائینەکان پیلانیان داڕشتبوو بەڵکو خەریکبوو جێبەجێشیان دەکرد.

چۆن دەتوانین خواست و ئیرادەی "ژۆپیتێر" لەبەرچاو نەگرین سەبارەت بەوشتەی کە سەرلەبەیانی ئەمرۆ بینیمان؟ لەکاتێکدا پەیکەرە دروستکراوەکەیان لەسەر پایەکانی داناو روویانکردە رۆژهەڵات کەبەرەو رۆماو کۆنگرەی پیران دەڕوانێت, هاوکات لە "فۆرۆم"و لەپەرەستگای "کەنکۆرد" تاوانباران خرانە ژێر پرسیارو لێکۆڵینەوەو تانوپۆی پیلانەکەیان ئاشکرا دەکرد. لەگەڵ دانانی پەیکەرەکە لەسەر پایەکانی و هاوکات لەگەڵ ئەوەدا کە "ژوپیتێر" روویکردە "رۆما" و " ئەنجومەنی پیران"و سەرنجی خۆی خستەسەریان, روناکیەکی ئاسمانی پیلانەکەی بۆ ئاشکراکردم. هەر ئەم مەسەلەیە بۆخۆی بەڵگەیەکی پتەوە بۆ دەربڕینی نەفرەت و توندوتیژی تۆڵە سەندنەوە لەخائینەکان. ئەوانە دەیانویست و پەیمانیان دابوو کەخوداکان لەپەرستگاکاندا, خەڵکانی بێ تاوان لەماڵەکانیاندا لەناو بڵێسەکانی ئاگردا بسوتێنن. هەرگیز لەتوانای مندا نەبوو پیلانەکەیان کەشفبکەم و نەخشەی خائینانەیان

پوچەڵبکەمەوە. ژوپیتێر... بەڵێ ژوپیتێری مەزن بوو دژ بەوان چەکی هەڵگرت, ئەو بوو بەرگری لە "کاپیتۆڵ" کرد, ئیلهامی یەزدانە نەمرەکانبوو رابەرایەتی دەکردمو ئازایەتی پێدەبەخشیمو یارمەتیدام بۆ دۆزینەوەی حەقیقەتەکان.

ئەم هەوڵانەی پیلانگێڕان بۆ راکێشانی سەرنجی "ئالوبرۆژ"ەکان دایان ئەو نهێنیەی "لانتلۆس"ی لەرووی "شێتیو دێوانەییەوە" بۆ هاوکارەکانی ئاشکرا کرد, ئەو نامانەی خستیە بەر دەستیان, ئایا هەموو ئەمانە نیشانەی ئەوە نییە کە خواکان رۆحیانی دیلی سەرگەردانیو دێوانەییو چاوەکانیشیانی کوێرکردووە. لێگەڕێن تاهەنووکەش (گلوا)کان ملکەچی رۆما نین, ئەمانە تەنها میللەتێکن کەئامرازی ململانێو شەڕیان وەك ئێمە هەیەو مەیلیشیان لەشەڕێکی لەوجۆرەیە, بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پێشنیاری ئەو نیشتمانفرۆشانەیان رەتکردەوە کەوڵاتەکەیان پێشکەشکردنو بەو پێشنیارە زێرینەیان قایلنەبوونو سەلامەتی وڵاتی ئێمەیان پێباشتربوو لەپەرەسەندنی وڵاتەکەیان. لەکاتێکدا بۆ سەرکەوتنیش شەڕو خوێنرشتنیان بەپێویست نەدەزانیو تەنها بێدەنگیان هەڵدەبژارد. هاوڵاتیان: پرسیارتان لێدەکەم داخۆ ئەمە خۆی پەرجویەکی دی نیە؟

بەهەرحاڵ ئێستاکە ئاهەنگی سەرکەوتنەکان لەهەموو پەرستگاکاندا دەستی پێکردووە لەگەڵ ژنو منداڵەکانتان لەم بۆنەو ئاهەنگانەدا بەشداری بکەن, هیچ کاتێك شانازیەکی وەها جوانو شیاو پێشکەش بە یەزدانە نەمرەکان نەکراوە, بەبێ ئەوەی دڵۆپێك خوێن بڕێژرێت, ئێوە سامناکترینو دژوارترین کارەساتتان تێپەڕاند. ئەی سەرکەوتووە بێچەکەکان, ئەی سەرکەوتوانی شەڕ نەکردو, ئێمە ئەو شەڕەمان بردەوەو سەرکەوتین, من فەرماندەتان بووم.





فەرماندەکەتان لەم شەڕەدا هەرگیز ئەو جلوبەرگە دادوەریەی دانەکەند کەنیشانەی ئاشتیو سەرفرازیە.

هاوڵاتیان؛ ئەو ناکۆکیانە بهێننەوە یادتان کە لەناوەوەی وڵاتدا هەمانبوو, هەندێ لەوانەتان بینیوەو ئەوانی دیکەشتان بیستووە, لەم ناکۆکیانەدا "سیلا" و "سولپسیوس" یان لەسێدارە دا, "ماریۆس" رزگارکەری رۆمابوو لەشار کرایە دەرەوەو هەندێکی دیکەیان درووخرانەوەو بێبەزەییانە خوێنی ژمارەیەك لەکەسایەتییە ناسراوەکانی رۆما رژا. "کۆنسوڵ ئۆکتاڤیۆس" بەزەبری چەك هاوکارەکەی خۆیی لەشار کردە دەرەوە لەم رووداوەدا لاشەی کوژراوەکان ئەم شوێنەی داپۆشیبوو کەئێستا لەسەری راوەستاوین. خوێنی رۆمیەکان وەك لافاو لەبەری دەڕۆیشت (ماریۆس) و (سینا)یش بەبۆنەی خۆیان سەرکەوتنیان بەدەستهێنا. بەڵام لەم ململانێیەدا, مەرگ چرای ژیانی پڕ لەشانازی گەلێك کەسی کوژاندەوەو رۆما زەخیرەیەکی بەنرخی لەدەستدا, راستە ((سیلا)) تۆڵەی لەو دڵڕەقانە کردەوە ئەو ناکۆکیانە بەنرخی گیانی کۆمەڵە لاوێکی چاپوکی رۆما تەواوبوو.

ئەو ناکۆکیانە بهێننەوە یادتان کەلە نێوان (کاتۆس) و (لیپدۆس)دا رویدا, (لیپدۆس) لەناوچوو, بەڵام تا چ رادەیەك کۆمار بۆ لەناوچوونی هاوڕێکانی بەداخ بوو؟

لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا هیچ یەك لەو ناکۆکیانە بۆ لەناوچونو روخانی کۆمار نەبوو, بەڵکو ژمارەیەك لە خەڵکی دەیانویست سیستەمە روکەشەکەی رۆما بگۆڕن. هیچکام لەم ئاژاوەچیانە

حەزیاننەدەکرد کۆتایی بەژیانی کۆمار بهێنن, بەڵکو دەیانویست کۆمارێك دروستبکەن لەژێر دەسەڵاتی خۆیاندا بێت. ئەوان نەیاندەویست رۆما لەئاگرو خوێندا نوقم بکەن, بەڵکو ئارەزویان ئەوەبوو کە لەڕۆمادا شانازییەك بەدەست بێنن. بەهەرحاڵ هەرچەندە ئەم ناکۆکیانە بەمەبەستی سەرنگونی وڵات نەبوو بەڵام گۆڕا بە جەنگێکی گەورەو ئاشتی هەڵنەگر کەتەنها لافاوی خوێن توانی بڵێسەی توندوتیژیو تورەیی دابمرکێنێتەوە. بەڵام ئەمجارە پیلانی خاینەکان بۆ درندانەترینو سامناکترین شەڕ بوو کە مرۆڤ هەرگیز لەبیری ناچێتەوە. جەنگێك لەهیچکام لەمیللەتە هۆڤیەکان ئەو کارەیان نەکردووە. لەم جەنگەدا "لانتلۆسو کاتلینا" و "ستۆگۆس" دژ بەو کەسانەی کە سەلامەتی رۆماو ئەوانەش پەیوەستبوون بەیەکەوە وەستابوون, بەڵام من بەشێوەیەکی کارامە روداوەکەم واخستەوە کەهەموویانم رزگارکرد, دوژمنەکانتان وایاندەزانی لەخەڵکی رۆما تەنها ژمارەیەك لەوکەسانە دەمێننەوە لەزینداندان,و لەشاری رۆماش تەنها ژمارەیەك خانو لەبڵێسەی ئاگر رزگاریدەبێت. چ ئومێدگەلێکی بێهودەبوو! من هەموانم لەدێوانەیی خائینەکان پاراست, چ رۆماو چ رۆمایەکانیش.

هیچ پاداشتو هاوارکردنو یادکردنەوەیەکم لەهەمبەر ئەو خزمەتە گەورانەمدا ناوێت. ئارەزووم ئەوەیە کەئێوە ئەمرۆ ئەو رۆژە گەورەیەتان هەمیشە لەبیربێتو بتوانم لەناختاندا سەرکەوتوبم ئارەزووم ئەوەیە هەموو شانازیەکانو بنەمای سەرکەوتنم لەناختاندا جێبکەمەوە. بەڕای من ئەو تەلارانەی بۆیادکردنەوە دروستدەکرێن,





هیچ بەهایەکی نییە, ئەم شوێنو تەلارە بێدەنگانە کەسانێك یاددەکەنەوە کەهیچ کاتێك شایستەی ئەوە نین.

خزمەتەکانم لەبیرەوەریتاندا دەمێنێتەوەو وتووێژەکانتان بەها و پێگەی زیاتر دەکاتو ئاهەنگەکانی ساڵانەتان ژیانێکی نەمری بەم بیرەوەریانە دەداتو رابردوتان دەهێنێتەوەیاد کەدوو سەردار هاوکات بەیەکەوە دەژیانو یەکێکیان سنوورەکانی وڵاتی[26] لەو سەرزەمینە ناودارانەی کەتێپەڕاندبوو بەرەو دواوە برد, و ئەوی دیکەیان پایتەختی کۆمارو بارەگای ئەو دەسەڵاتە گەورەیەی رزگارکرد.

چارەنووسی منو ئەو سەرکردانەی لەدەرەوەی سنورەکاندا سەرکەوتنیان بەدەست هێنا وەك یەك نەبوو. من دەبێت لەناو کەسانێکدا بمێنمەوە کەبەدەستی من تێکشکان, بەڵام ئەوانەی کە لەدەرەوە دەجەنگان, دەبێ دوژمنەکانیان بەرەو بێهودەیی رەوانەبکەن. هاوڵاتیان؛ ئەو سەرکردانەی کەلەدەرەوەی قەڵەمرەوی خۆیان سەرکەوتن بەدەستێنن, رێزیان لێدەگیرێ, ئێوەش کارێك بکەن کەمن لەهەمبەر خزمەتەکانمدا سزا نەدرێم. من ئێوەم لەپیلانی ژمارەیەك خایین رزگارکرد, ئێستا نۆبەی ئێوەیە کەمن لەتۆڵە سەندنەوەی ئەوان بپارێزن. هەنوکەش خەڵکانێکی چاك دەمپارێزنو هیچ باکم لەدوژمنان نیەو هەمیشە خۆم بەپارێزراو دەزانم. ئەوە کۆمارو مەزنیەتی ئەوە کەمنی لەژێر سایەی خۆیدا پاراستووە, و دەنگی حەقیقەتە ئابڕوی دوژمنانی دەبات, بوێریو خۆڕاگریم

(26)مەبەستی لە "پەمپە" سەرکردەی بەناوبانگی رۆمایە.

پاسەوانێکی دیکەی منن کەلەهەمبەر هەر خائینێکدا دەوەستمو ئازایەتی ئەوەم تیایە پێشبڕکێ لەهێرشکرندا بکەم.

ئەگەر بەهۆی ئەوەوە کەئێوەم لەدێوانەیی تاوانی خیانەتکاران رزگارکردووە, دوژمنەکانتان هێرشەکانیان ئاڕاستەم دەکەن, ئەوا ئێوە دەتوانن بۆیاندەرخەن چارەنووسی خزمەتکارەکانو کەسانێك کەژیانیان بەهۆی فیداکاریەوە لەپێناوی ئێوەدا لەمەترسیدایە, چیە؟

هەنوکەش لەپێناوی بەدەستهێنانی شانازیو ئابڕو,و ناوی چاکدا قۆناغێکی بالآتر نیە لەوشتەی کەبەدەستم هێناوە, ئیدی دەکرێ چ ئامانجێك لەژیاندا هەڵبژێرم؟ ئامانجو ئارەزووم ئەوەیە ئەو ناوبانگە چاکو ئابڕوەی کەبەدەستم هێناوە بیپارێزمو هەڵیگرم بۆ رۆژانی گۆشەگیریم, بەکوێرایی چاوی دوژمنانم رقو نەفرەتی ئەوان کەلەئاکامی رزگارکردنی کۆماردا پێمبەخشراوە شازیەکانم زیاتر دەکات,و کۆماریش من بەخزمەتکارێکی شایستەی دەزانێت, ژیانم شایەتی دەدات کەهەرچیەکم کردووە رێکەوت نەبووەو باوەڕداریو خۆپاراستن هەمیشە رێنماییان کردووم.

هاوڵاتیان؛ هەنوکەش کەرۆژانی دوایی کۆتایدێت. دەستی دۆعا بەرەو "ژوپیتێری مەزن" بەرز بکەنەوە, ئەو پارێزەری رۆماو ئێوەیە, بەرەو ماڵەکانتان برۆنو هەرچەند مەترسی نەماوە, بەلآم وەك شەوانی رابردوو درێژە بەچاودێریەکانتان بدەنو بەخێرایی لەزەحمەتی ئەو چاودێریانە ئاسوودەتان دەکەمو بۆ هەمیشە ئاسودەییو ئاسایشتان دابیندەبێت.



# وتاری چوارەم

# دژ بە کاتلینا

# وتاری چوارەم

# دژ بە کاتلینا

**ئەم وتارە لەئەنجومەنی پیران رۆژی پێنجی دیسامبەر پێشکەشکراوە**

ئەی باوکانی بەڕێز؛ لەنیگاکانتدا خەمەکانتان دەخوێنرێتەوەو ئەو مەترسیانەی منیان لەخۆگرتووە, ئێوەی خەمناك کردووەو هەنوکەش کە کۆمار رزگاری بووە نیگەرانی چارەنوسی منن. بایەخدانی بەئەرزش‌و دڵفراوانیتان ئازارەکانمان هێورو برینەکانمان ساڕێژ دەکات.

ئەی باوکانی بەڕێز؛ بەناوی خوداکان لەبیری سەلامەتی مندا نەبن‌و لەبیری سەلامەتی خۆتان‌و ماڵ‌و منداڵتانا بن, بەدەنگی بەرز رایدەگەیەنم, ئەگەر دەمزانی بوون بە "کۆنسول" بەنرخی چەشتنی هەموو تاڵیەکان‌و تەحەمولکردنی هەموو نائارامیەکانی جیهان تەواو دەبێت, بەڵام بمزانیایە کەلەڕۆژگاری (کونسولای) مندا رزگاری "ئەنجومەنی پیران" و "کۆمار" بەدەستی من ئەنجام ئەدرێت هەموو تاڵی‌و دژواریەکانم بەگیان دەکڕی.

ئێوە بینیتان لەڕۆژگاری (کۆنسوڵا)یمدا هەمیشە ژیانم لەمەترسیدابووە, نە لە "فۆروم" کەمیحرابی پیرۆزی یاساو دادپەروەریەو نەلە "شان دۆمارس" کە "شورای کۆنسولا"یەو لەدەست درێژی پارێزراوەو نەلە "ئەنجومەنی پیران" کەپەناگەی گشتی کۆمەڵانی خەڵکە, لەهیچ جێگایەکدا گیانم لەئاسایشدا نەبوو,





بۆمن ماڵەکەم شوێنێکی پارێزراوو بێترس نەبوو, پێخەفەکەشم جێگای حەوانەوە نییە, تەنانەت لەم شوێنە پڕ شانازی‌و بارەگایەی لێیدانیشتوم دەمسیسەو مەترسیەکان هەڕەشەم لێدەکەن‌و رازی بوون‌و بێدەنگیم هیچکامیان کاریگەریان لەسەر بڕیاری خائینەکان دانەنا, بەبوێرییەوە دەڵێم ئازاری زۆرم کێشا تا توانیم نیگەرانیەکی زۆرتان لێدوربخەمەوە, سەردەمی کۆنسولایی من تا کۆتایی هەروا دەبێت.

رەزای خوداکان لەوەدابوو کەڕزگاربوونی خەڵکی لەدەست راوو رووت, و ژنان‌و منداڵان‌و (پیرۆزان) و (ستا [27])لەدڕندەترین سوکایەتی‌و ئەم نیشتمانە جوانەش کەدایکی هەمومانە لەسوتاندن, ئیتالیاش لە جەنگ‌و وێرانکردن بەدەستی من ئەنجام بدرێت‌و ئەم شانازییانەشم پێببڕێت, ئەم شانازیانەم بەهەر نرخێك دەکڕی گەر چارەنوسمی لەخۆگرتایە. هەنوکەش "غەیبگۆیان" بە "لانتلۆس" یان وتووە کەچارەنووس‌و قەدەری خاپوورکردنی وڵات بەو سپێردراوەو ئەویش قسەی ئەوانی قبولّ کردووە, ئایا لەجێی خۆیدا نییە من خۆم بە سەرفراز بزانم کەلەهەمبەر ئەودا پاراستنی وڵاتم پێسپێردراوە؟

ئەی باوکانی بەڕێز بیر لەچارەنووسی خۆتان‌و وڵات بکەنەوە بۆ پاراستنی خۆتان‌و ماڵ‌و منداڵتان‌و داراییەکانتان بڕیار بدەن. داکۆکی لەئابڕوو ژیانی خەڵکی رۆما بکەن, کاتی ئەوە نییە بیر لەمن بکەنەوە, خوداکان کەهەمیشە ئەم شارەیان پاراستوە, کارو تێکۆشان‌و

(27) رۆمیەکان خواوەندی ئاگرو رواڵەتی بنەماڵەیان بەناوی "مقدسین –و– ستا" یان "پیرۆزان" و "ستا" ناوزەد دەکرد.

خزمەتەکانم بێپاداشت ناهێڵنەوە, گریمان وادەرنەچوو, ئەوسا من بێخەمو ترسەوە پێشوازی لەمەرگ دەکەم.

لەڕاستیدا مەرگ بۆ پیاوێکی ئازا جێگای شەرمەزاری نییە بۆ کونسولێك کەهەموو پلەکانی شانازی بڕیوە زوو نیە بۆ پیاوانی باوەڕداریش مایەی خەفەت نییە. لەگەڵ ئەوەیشدا دڵم ئاسن نی‌یە هیچکات ناتوانم لەهەمبەر ئازاردانی براکەم[28]"دا کە تا ئەو رادەیەی خۆشیدەویٚمو منیش رێزی لێدەگرمو هەروەها لەهەمبەر خەفەتی ئەو سەناتۆرانەی منیان لەخۆگرتووە, بێهەستبم کارێکی سروشتیە کەجار جار ئەندێشەم بەرەوماڵەوە پەلکێشم دەکاتو لەوێ لەگەڵ هاوسەرە غەمبارەکەمدا رووبەڕوو دەبمەوەو "کچێکی[29]" بەلەرزە دەرهاتوو و غەمگین دەبینمو کوڕە بچکۆلەکەم لەجۆلانەکەیدا دەبینمەوە. ئەوانە بارمتەگەلێکی بەنرخن کە وەڵامدەرەوەی رۆژگاری دەسەڵاتداریمن لەهەمبەر کۆماردا, هەر لەو شوێنەدا "زاواکەم[30]" دەبینم بەنائارامی

(28) "کینتیۆس شیشرۆن" برای "مارکۆس تیلیۆس شیشرۆن"ە کەلەو ساڵەدا لەپلەی "پەڕتو"دا بوو.

(29) کچەکەی شیشرۆن ناوی "تولیا" بوو لەساڵی 65ی پ.ز لەگەڵ "کالپۆرنیۆس" دا بوون بەهاوسەرو لەساڵی 58ی پ.ز ئەو زاوایەی شیشرۆن کۆچی دوایی کرد. دوای ئەوە تولیا شویەکی دیکەی کرد کە تەڵاقی لەمێردی دووەمی وەرگرت. پاشان شوی کرد بە "دولابلا" وئەم شوکردنەش ئەنجامەکەی تەڵاق بوو. شیشرۆن کچەکەی زۆر خۆش دەویستو هۆشیاریو زانیاریەکەیی ستایش دەکرد. کوڕەکەی لەساڵی 64ی پ.ز لەدایکبووە.

(30) لەم کاتەدا زاواکەی شیشرۆن "کالپۆرنیۆس" بوو و لەبەرئەوەی کە گەنجو بوو رێی پێنەدەدرا بچێتە "کۆنگرەی پیران" لەبەردەم بیناکەی





چاوەڕوانی کۆتایی کۆبوونەوەکەو راگەیادنو ئەنجامی بڕیارەکانی ئەم رۆژە مێژوییە دەکات. بێگومان ئەم بوونەوەرە خۆشەویستانەن ئیلهامی ئومێدو خۆشەویستیم پێدەدەن. ئارەزووم ئەوەیە, ئێوە رزگار بکەم, دڵشاد دەبم خۆم لەم رێگایەدا بەخت بکەم تاماڵو منداڵەکەمو "ئەنجومەنی پیران"و کۆمارەکەمان رزگار بکەم. ئەی باوکانی بەڕێز: بۆ رزگاری وڵات هەمووشت فەرامۆشبکەن, ئەو زریانە سامناکەی ئێوەی گەمارۆداوە (ئەگەر رێگا چارەیەکی بۆ نەدۆزرێتەوە ئەوا هەڕەشە لەبوونمان دەکات) بهێننە پێش چاوتان, مەسەلەکە تەنها ئەوە نیە کە "تیبریۆس گراگۆس" بۆ بەدەستهێنانی پلەوپایە, یان "کایۆس" بەهۆی داهێنانی یاسای زیانبار, یان "ساتور نینۆس" بەهۆی کوشتنی "میمۆس" تاوانبارکرابنو لەبەرامبەر ئەو کارانەی ئەنجامیان داوە چاوەڕێی "حوکم" و "رای" ئێوەبن. ئەو کەسانەی چارەنووسیان لەدەست ئێوەدایە کەسانێکن کەلەڕۆمدامانەوە بۆئەوەی ئەم شارە نغرۆیی ئاگر بکەنو بیسوتێننو سەرمان ببڕنو دەرگاکانی رۆما لە کاتلینا بکەنەوە, نامەی ئەو کەسانەتان لەبەردەستایەو مۆرو واژۆی نامەکانیان دەناسرێتەوەو ئیعترافکردنیان دەزانن. ئەوان دەیانویست "ئالوبرۆژ"ەکان لەگەڵ خۆیاندا بهێنن بیانکەنە هاوکاری خۆیانو خەریکبوون کۆیلەو غولامەکان یاخیبکەن. ئەوان بانگهێشتی کاتلینایان بۆ رۆما کردو نەخشەیان بۆ کوشتنو بڕینی خەڵکی داڕشتبوو, دەیانویست کۆمەڵکوژیەکی وەها بکەن تەنانەت یەك

کۆنگرەی پیران دا بەشێوەیەك وەستابوو کەئەو کەسەی بۆ قسەکردن هەڵدەستایە سەرپێ دەیتوانی ئەو ببینێت.

کەسیش نەمێنێتەوە تا فرمێسك بەسەر وێرانیەکانی شاردا برێژێ و شین و زاری بۆ خاپورکردنی ئیمپراتۆریەتێکی وا مەزن بکات.

بەڵگەو شایەتە حاشا هەڵنەگرەکان بونی پیلانەکەیان سەلماندو پیلانگێران دانیان پیانا, ئێوە زیاد لەجارێك سەبارەت بەم پیلانە راتان دەربریوەو داوەریتان کردووە, یەکەم دادوەریتان ئەو پێزانینە پڕ شانازیەبوو کەلەهەمبەر مندا دەرتانبڕی, و راتانگەیاند کەمن بەئازایەتی و چاودێریە هەمیشەییەکانم توانیومە پیلانێکی ترسناك و تاوانکارانە بدۆزمەوە. فەرمانی دەرکردنی "لانتلۆس"و دەستگیرکردنی ئەوو هاوکارەکانی دادوەرییەکی دیکەی ئێوەبوو دەربارەی ئەم پیلانە, و لەکۆتایشدا کاتێك ئەو کارەتان پێسپاردم تا بۆنەی سوپاسگوزاری دەرهەق بەیەزدانە نەمرەکان ئەنجام بدەم, ئەوەش کارێکی دیکەی ئێوەبوو دەربارەی پیلانەکە, چونکە تا هەنوکەش ئەمکارە ترسناکە فەرماندە سەربازیەکان ئەنجامی دەدەن کەلەشەڕدا سەرکەوتو دەبن, و سپاردنی ئەمکارەش بەمن گەواهی لەسەر گەورەیی پیلانەکە دەدات. دوێنێ ئێوە هەندێ پاداشتی گونجاوو گەورەتان بۆ نوێنەرەکانی "ئالوبرۆژ" و بۆ "کیۆس- و- ڤۆلتۆریۆس" دانا, ئایا ئەمانە بەڵگەگەلێك نین سەبارەت بەوەی ئێوە تاوانی ئەوکەسانە دەسەلمێنن کەناویان لەلیستی بەندکراوەکاندا هاتووە؟

باوکانی بەڕێز: کاتێك من داوامکرد کەدووبارە بابەتەکە لەدەستوری گفتوگۆکانتانا دابنێن, بۆئەوە بوو دەرفەتتان هەبێت دەربارەی تاوان و سزادانیان رای خۆتان لەکۆبونەوەیەکدا رابگەیەنن. بەرلەوەی راتان دەرببڕن واپێویستدەکات منیش وەك کۆنسوڵێك هەندێ روونکردنەوەتان بۆ بخەمە ڕوو. ماوەیەکبوو لەناوخۆی





کۆماردا هەستم بەهەندێ چالاکی زیانبار دەکردو دیاربوو دەیانویست گروپێك پێکبهێنن کە زەمینەی هەندێ کارەساتی نادیارمان بۆ خۆش بکەن. بەڵام هەرگیز لەوباوەڕەدا نەبووم کەسانێك هەبن پیلانێکی وا بەربڵاوو ترسناکیان دارشتبێت. هەنوکەش کە رووداوەکەتان بۆ روونبۆتەوە راتان هەرچییەك بێت, دەبێ بەر لەهاتنی شەو رابگەیەنرێت, بینیتان کە چ تاوانێکی بکوژانەو سامناك لەبۆسەدایە؟

باوکانی بەڕێز: گەر وادەزانن کەژمارەیەکی کەم لەو کەسانە دەستیان بەتاوان ئالودە بووە, بەهەڵەداچوون, پیلانەکە هێندە بەربڵاوو گەورەیە وێنا ناکرێت. هەموو ئیتالیای ژاراوی کردووە, چی بڵێم؟ لە (ئەڵپی) تێپەڕاندووە بەپەرەسەندنێکی نادیار ویلایەتەکانی دیکەشی گرتۆتەوە, مەحاڵە سەبرو تێپەڕبوونی رۆژگار بتوانێت بڵێسەی ئەم پیلانە بکوژێنێتەوە. هەردەرمانێك بۆ چارەسەرکردنی دابنێن ئەودەمە کاریگەری دەبێت کەبەپەلەو لەکاتی خۆیدا (تەجوین) بکرێت.

ئێستا لە "ئەنجومەنی پیران"دا دوو بیروڕای جیاواز هەیە, ژمارەیەك لە "سەناتۆر"ەکان لایەنگری بیروڕای "سیلانۆس"ن کە بۆ سزادانی خائینەکانی وڵات سزای لەسێدارەدان بەپێویست دەزانێت, ژمارەیەکی تر لە "سەناتۆر"ەکان لایەنگری لەبیروڕای (سزار)دەکەن و سزای لەسێدارەدان رەتدەکەنەوە, بەڵام لەنێو تەواوی سزاکاندا هیچ سزادانێك بۆ تاوانێکی وەها گەورە بەتوند نازانن.

ئەم دوو"سەناتۆر"ە هەرکام بەشایستەیی ئەو چینەی کە پێوەی وا بەستەن بیروڕای خۆیان بەجۆرێك دەربڕی, بەڵام لە بیروڕاکانیاندا توندو تیژیەك دەردەکەوێت کە گرنگی تاوانەکە ئاشکرا دەکات.

بەپێی بیروڕای "سیلانۆس" ئەوکەسانەی بڕیاریاندابوو بمانکوژن‌و خەڵکی جینۆساید بکەن‌و ئیمپراتۆری لەناو ببەن‌و تەنانەت دەیانویست ناوی ڕۆماش بسڕنەوە, شایانی ئەوە نین تەنانەت بۆ ساتێکیش چاویان بەڕۆشنایدا هەڵبێت‌و لەم هەوایەی دەیانویست ئێمەی لێبێبەشکەن, تەنها نەفەسێکیش هەڵمژن. بۆ پشتگیری لەبیروڕاکانی ئاماژەی بەپێشبینیە مێژوویەکان دەکرد, کەئەوکارانە دەردەخات میللەتی ڕۆما چەندین جار کەسانی خائینی بەسزای مەرگ گەیاندووە.

باوەڕی "سزار"یش ئەوەیە خوداکان هیچکات "مەرگیان" بەئامرازێك بۆ سزادان نەزانیوە. "سزار" دەڵێت مەرگ یاسایەکی سروشتیە کۆتایی بەکارو ئازارو بەدبەختیەکان دەهێنێت. هەر لەم ڕووەوەیە پیاوی باوەڕدار هیچ کاتێك بەپەژارەوە مردن قبوڵ ناکات‌و تەنانەت پیاوانی ئازا بەپێشوازی مەرگەوە دەڕۆن. گومانی تێدا نییە کەداهێنانی حوکمی ((زیندانی ئەبەدی)) بەکۆت‌و زنجیرەوە بۆ ئەم مەبەستەبووە کەبتوانرێت خیانەتە گەورەکان بەمجۆرە سزایان بدرێت.

هەروەها "سزار" لەو باوەڕەدایە ئەو تاوانبارانەی "حوکم دراون" بەسەر شارەکاندا دابەش بکرێن بەڵام هەڵگرتنی بارێکی وا لەسەرشانی دانیشتوانی شارەکان کارێکی ڕاست نیە,و قبوڵکردنی داواکاریەکی وەها لەشارەکان کارێکی ئاسان نییە. لەگەڵ ئەمەیشدا ئەگەر بەباشی بزانن فەرمانی پێویست دەربکەن من بەم بەرپرسیارێتییە قایلدەبم بەدوایدا دەچم تا بەڵکو چەند شارێك پەیدا بکەم ئەم شازیە قبوڵبکەن‌و لەم ئەرکەشمدا بەشداریبکەن کەبۆ بەرژەوەندی گشتیە. نابێت ئەوەش لەبەرچاو نەگرین کەئەگەر زنجیری یەکێك لەو تاوانبارانە بپچڕێت یان بکرێتەوە چ دواڕۆژێکی دژوارو





مەترسیدار بۆ دانیشتوانی شارەکە دەهێنێتە پێشەوە. "سزار" لەوباوەڕەدایە وەك پێویست دەبێت بەندیخانەی ئەم تاوانبارانە بەهەیبەت‌و سامناك بێت‌و پێشنیاری پتەوکردن‌و پارێزێکی زۆر سەبارەت بە داوەریکردنی پیلانێکی ترسناك دەکات. داوا دەکات ماڤ داواکردنی " لێخۆشبوون لە کۆنگرەی پیران"و خەڵکی بسەنرێتەوە, تا ئیتر نەتوانرێت لەئایندەدا لێبوردنیان بۆ دەربکرێت‌و, بەم کارەش "ئومێد" کە تەنها سێبوری بەدبەختەکانە لێیان زەوتبکرێت, "سزار" پێشنیاردەکات جگە لەگیان هیچی دیکەیان بۆ نەمێنێتەوە. ئەو لەوباوەڕەدایە کەناتوانێت گیانی وەها تاوانبارانێك بەئاسانی بگیرێت, چونکە بەساتێکی کەم ئێش‌و ئازارو هەمووشتێك کۆتایی دێ. چونکە شایستەی کارێکی لەوجۆرەن سزانادرێن. بۆ ڕێگرتن لەوکەسە شەڕخوازانەی کە تاوانیان ئەنجامدەدا, حیکمەتی ڕابووردووەکانمان زیندانیان بەکۆت‌و زنجیرەوە داهێناو, پێیانوابوو کە "تاکۆتایی ژیان" خاینەکان لە کۆتو زجیردابن‌و ئەشکەنجە بدرێن. ئەوان دەیانزانی کە ئەگەر ترس‌و لەرزێك لەوجۆرە سزادانانەدا نەبێت, هەرگیز خائینەکان لەمەرگ ناترسن.

باوکانی بەرێز: بەرژەوەندی تاکە کەسیم ئەوەیە پشتگیری لەڕای سزار بکرێت. "سزار"لەژیانی سیاسی خۆیدا هەمیشە لە ڕێگایەکەوە هەنگاوی ناوە کە خەڵکی پێیان خۆشبووەو, پێشنیارەکانی بەهۆی ئەو دەسەڵات‌و هێزەی لەناو خەڵکیدا هەیبوو, بەئاسانی وەردەگیراو, کەمتر ئێمەی دەخستە ژێرکاریگەری ئایدیاو بیروباوەڕەکانەوە, وە بەپێچەوانەوە پەسەندکردنی بیروڕای (سیلانۆس)و جێبەجێکردنی, ئێمەی ڕووبەڕووی مەترسییەکی زۆر دەکردەوە بەڵام لەکاتێکدا کە

بەرژەوەندییەکانی وڵات لەئارادایە, داخۆ شیاوە بیر لە ئاسایش و بەرژەوەندی خۆم بکەمەوە؟

ئەمجارەیان (سزار) بەوبیروڕا شیاوو تایبەتمەندییە باڵایەی زەمانەتێکی شایشتەی دی لەمەڕ خۆشەویستی خۆی بۆ نیشتمان دەربڕی, ئەوەی بۆ ڕوونکردینەوە کە مەودایەکی زۆر ڕوخساری میللی واقعی, لەڕوخساری میللی بێ نرخ جیادەکاتەوە, ئەوان لەبیری پیاهەڵنان و خۆبردنە پێشەوەن و, ئەمیش لەبیری رزگارکردنی خەڵکدایە.

یەکێك لەکەسایەتیە میللییەکان تەنانەت نەیویست لەو کۆبونەوەیەدا ئامادەبێ, دیارە خوازیار نەبووە سەبارەت بەسزادان و زەوتکردنی ژیانی ژمارەیەك لەڕۆمیەکان رای خۆی دەربڕێت. لەکاتێکدا هەر ئەم کەسە پێری ژمارەیەك خەڵکی لە بەخششی ئازادی بێبەشکردو لەو کەسانەبوو کەفەرمانیدەرکرد بەناوی منەوە ئاهەنگی خۆشی و شادی سازبکرێت. دوێنێ ئەو بۆ کەسانێك کەپیلانەکەیان ئاشکرا کرد پاداشی گونجاوو بەنرخی پەسەندکرد. ئایا کەسێکی وا کەبەندکردنی تاوانبارانی پەسەند کردو پاداشتی ئەو کەسانەی کرد کەپیلانەکەیان ئاشکرا کردو پیرۆزبایی لە دادوەری دادگاو بەڕێوەبەری کارەکانکرد, دەتوانێت لاف ئەوە لێبدات بیروڕای خۆی گەوهەرو بابەتی تاوانەکە دەرنەبڕیوە؟

"سزار" بەباشی ئاگادارە کە یاسای "سمپرونیا" تایبەتە بۆ ڕێکخستنی ژیانی هاوڵاتیانی ڕۆما, بەڵام ناکرێ دوژمن بەهاوڵاتی ڕۆما بزانین. هەربۆیە ئەوکەسانەی ئەم یاسایەیان دارِشت خۆشیان بەهۆی پیلانگێڕان دژ بەکۆمار "تاوانی" گوناهەکەیاندا. ناکرێ "سزار" باوەڕ بەوەبکات کە "لانتلۆس" لەگەڵ ئەو هەموو زیادەڕەوی و





دەستدرێژیکردنەیدا بەهاوڵاتی بناسرێت. کەسێك کەدەیویست هەمو خەڵکی ڕۆما بکوژێت و شاری ڕۆم بکات بەگردێك لەخۆڵەمێش, چۆن دەکرێ بەهاوڵاتی ڕۆمای بناسین؟ هەر لەبەرئەوەیە ئەم پیاوە دڵسۆزە (کە سەراپای بوونی تا ئەوپەڕی دەسەڵاتی تێکەڵ بەبەزەیی و دڵسۆزی بووە) لەڕەوانەکردنی "لانتلۆس" بۆ "گەرووی تاریکی زیندانی هەمیشەیی" هیچ گومانێکی نەبوو. کاتێك پێشنیار دەکات ماف لێبوردن لەم پیاوە خیانەتکارە بسەندرێتەوە, بۆ هەمیشە دەرگا لەهەمبەر ڕۆڵی تەواوی خۆدەرخستنەکانی دادەخات. ئەو ئامادە نییە بۆ بەدەستهێنانی موڵك و سەرمایە ڕۆما لەناو ببات و یان لەداهاتوودا کەسێك پێشبینیەکی وەهای لێبکات. کاتێك پێشنیار دەکات کەدەست بەماڵ و سامانی بەندکراوەکاندا بگیرێت لەبەرئەوەیە کەبەهۆی هەژار کردنیانەوە ئازاری ڕۆح و جەستەی خائینەکان سەختترو توندتربێت.

لەتەك پەسەندکردنی رای "سزار", ئێوە پێگەیەکی پتەوترم لەهەمبەر خەڵکیدا پێدەبەخشن, کەهەموو هەڵاوردنەکانی ئەو پێگەیەم لەخۆ دەگرن. بەڵام ئەگەر پشتگیری لەڕای سیلانۆس بکرێت, من و ئێوە دەتوانین خۆمان لەتانەو تەشەری خەڵکی سەبارەت بەکاری توندوتیژی بەئاسانی بێبەری بکەین و هەمووش دەزانن سزایەکی ئاسانترو ئارامتر دەرهەق بە بەندکراوەکان بەکارهاتووە.

پاشان باوکانی بەڕێز کام سزادانە دەتوانێت بۆ ئەمجۆرە خیانەتانە دژوارو زاڵمانە بێت؟

باوکانی بەڕێز: بۆ سەلامەتی و خۆشبەختی کۆمار, کە گەورەترین خواستمە, سوێند دەخۆم, کەئەم دژوارییانە لەڕۆحێکی بێبەزەیی و شەڕانییەوە هەڵنەقوڵاوە, داخۆ کەسایەتییەك هەیە لەکەسایەتی من گونجاوترو بەبەزەییتر بێت؟ من ئیلهام لەمرۆڤایەتی وەردەگرم, ئەم

توندو تیژیانە زێدەی بەزەیی و میهرەبانیە. کاتێك دێتەوە بیرم كەدەیانویست ئەم شارە قەشەنگ و جوانە (شاژنی شارەکان و خشڵ و زێڕی جیهان و پەناگای گشتی میللەتەکانە) بسووتێن کاتێك لاشەی خەڵکانی رۆم دەهێنمە بەرچاوم کە لە کەلاوەکانی نیشتماندا بەسەر یەکدا کەڵەکەبوون وەگۆڕستانێك نییە کەبەخاکیان بسپێرن, کتوپڕ روخسارە سامناکەکەی "ستۆگۆس" لەبەرامبەر چاوەکانما دەردەکەوێت کەلەوپەڕی بێبەزەییدا لەنێوان ئەو شەپۆلانەدا کەخوێنی ئێوەیە تینوێتی خۆی دەشکێنێت کاتێك ئەوە دێنمە بەرچاوم کە "لانتلۆس" بەپێی وتەی خۆی ئیلهامە غەیبەکان بەڵێنیان پێداوە دەست بەسەر ئەم ولاّتەدا بگرێت و (گابینیۆس) لەجلوبەرگی سووردا دەهێنمەوە بەرچاوم و کاتلینا دەبینم کەلەپێش سوپاکەیەوە هاتۆتە شاری رۆمەوە, لەنێو ئەم خەیالاّنەدا هاواری زویرانەی دایکان لەگوێمدا دەنگ دەداتەوەو منداڵە بێتاوانەکانیان دەبینم لەبەردەم کەسانێکدا (کەدەیانەوێت دەستدرێژی بکەنەسەریان) بەشڵەژاوییەوە رادەکەن, ژنانی باوەڕدارو پاکژ لەبەرامبەر خۆمدا دەبینم بەخراپترین شێوە سەرزەنشت دەکرێن, کاتێك ئەم دیمەنە پڕ لەئێشو ئازارانە لەبەرامبەر چاوەکانم تێدەپەڕن لەهەمان کاتدا کەهەستی بەزەیم تێدا دەوروژێت لەبازووەکانمدا هەست بەتوندتیژییەکی بەجێ و گونجاو دەکەم.

باوکانی بەڕێز: ئەگەر باوکی خێزانێك ببینێت کەغولاّمێك منداڵەکەی کوشتووەو ژنەکەی بێگیان کردووەو ماڵەکەی سووتاندووەو گردێك لەخۆڵەمێشی بۆ هێشتۆتەوە, ئەگەر بەبینینی ئەم نەهامەتیانە نەیەوێت گەورەترین تۆڵە بسێنێتەوە, دەپرسم داخۆ بێدەنگی ئەوپیاوە بەهۆی میهرەبانی و شەڕانگێزیی و بەزەیی یان





بەهۆڤێتی دەزانن؟ من دەڵێم کەسێکی وا ئەگەر بەئازارو ئەشکەنجەدانی بکوژەکە, ئازارەکانی هێور نەکاتەوەو عەزابەکانی سووك نەکات, من ئەو کەسە بەخاوەن دڵێکی ئاسن و رۆحێکی نامرۆیی دەزانم. باوکانی رێزدار: ئێمە لەبارودۆخێکداین کەئەم کەسە ناپاکانە دەیانویست ژن و منالەکانمان بکوژن, ئەمانە دەیانویست ماڵەکانمان و ئەم شارە جێگەی حەوانەوەی ئەم گەلە گەورەیە لەگەڵ خاکدا یەکسان و خاپووربکەن, بەئاماژەیەکی ئەوان "بەربەرەکان" لەسەر خۆڵەمێشی شارەکان کەهێشتا دوکەڵی لێبەرزدەبۆوە ئامادەبوون و (گلواکان) لەسەر کەلاوەکانی رۆمادا دادەنیشتن, لەبەرامبەر ئەمانەدا توندوتیژی کردەوەیەکی مرۆییەو, لێبوردن و چاوپۆشیکردن لەهۆڤێتی و لاوازیش, ئاماژەیەکە بۆ بێ بەندو باری ئاژەڵی دەرهەق بەئازارەکانی نیشتمان.

باوکانی بەڕێز: واتە واتێك دەبیستم کەناتوانم دەرهەق بەوانە بێدەنگبم, لەنێو ئێوەدا قسە گەلێك بەگوێ دەگات, حیکایەت لەنیگەرانیتان دەکات, ژمارەیەك لەئێوە لەوە دەترسن هەندێ کەرەسەی پێویستم بۆ ئەنجامدانی بڕیارەکانی ئەمڕۆ لەبەردەستا نەبێت. باوکانی بەڕێز: هەمووشتێك پێشبینی کراوەو فەرمانی پێویستیش دەرچووە, لەئەنجامی چاودێرییەکانم و بەرژەوەندیی ئەندێشەکانم و لەوانەش گرنگتر لەئەنجامی هیمەت و گەورەیی (خەڵکی رۆما کەبڕیاریانداوە ئیمپراتۆریەت و ئازادی و ماڵی خۆیان بپارێزن) هەموو شتێك ئامادەکراوە. تێکڕای خەڵکی لەهەر چین و توێژو لەهەر تەمەنێکی جیاوازدا لەهەرلایەکەوە لەدەورمان کۆبوونەتەوە, (گۆڕەپانی گشتیی) پڕە لەخەڵك, هێندە قەرەباڵغە شۆستەو شەقامەکانی کەلەگۆڕەپانی گشتیدا تەواودەبن بەرگەی ئەو

دانیشتوانە زۆرە ناگرن. لەڕاستیدا بۆیەکەمجارە پرسێکی یەکگرتوو ئەو کەسانە لەدەوری یەك کۆدەکاتەوە کەبیروڕای جیاوازیان هەیە. تەنها کەسانێکیان لەتەکدا نییە کەلەناوچوونی خۆیان لەبەرچاوە, چونکە نایانەوێ بەتەنهایی بەرەو لەناوچوون بڕۆن, هەوڵئەدەن بەڵکو بتوانن هەموومان لەگەڵ خۆیاندا ببەن, من لەجیابوونەوەیان خۆشحاڵم‌و ئەوان بەچینێکی تایبەت دەزانم‌و نابێت ئەوان بەهاوولاوتی خراپ بزانین بەڵکو ئەوان بەدوژمنانی ئاشتی هەڵنەگری ولات بناسین. ئەی یەزدانە مەزنەکان چ هیمەت‌و چ فیداکاری‌و چ یەکدەنگیەك بۆ رزگاری‌و شانازی ولات هەموو چین‌و توێژەکانی گەلی پێکەوە گرێداوە. داخۆ پێویستە قسەیەك لەسەر جەنگاوەرەکانی رۆما بکەم؟ ئەوان بەهۆی چین‌و پێگەی کۆمەلایەتی خۆیانەوە لەپشت سەرتانەوەن‌و لەڕێگای بەدەستهێنانی شانازی‌و نیشتمانپەروەریدا شان بەشانی ئێوە هەنگاو دەنێن. لەکۆتاییدا لەپاش سالانێك جیاوازی‌و دووبەرەکی لەم رۆژە گەورە مێژووییەدا لەئەنجامی ئامانجە هاوبەشەکاندا, سازش‌و ئاشتی لەناو هەموو کۆمەڵگادا بەرقەرار بووەو ئەم ئامانجە پیرۆزە رستێك پەیوەندی‌و یەکێتی لەنێو خەڵکیدا پتەوکرد. داخۆ ئەشێ ئەم یەکێتییەی کەلەڕۆژگاری "کۆنسولای" مندا پتەو بوو, بپارێزرێت؟

ئەگەر ئەم یەکێتییە بەپایەداری بمێنێتەوە لەهەمبەر هەوڵ‌و تەقەلای خائینانەی دوژمنانی ناوخۆدا, ئیدی هیچکاتێك رەوا نییە نیگەرانبین. ئەمڕۆ من شایەتی خۆشی‌و کامەرانی گشتیی بووم لەنیو بەرپرسانی ولات‌و خاوەن پلەو پایەکانی خەزێنەی ولات‌و فەرمانبەرەکانیدا. ئەم خەڵکە بەشەرەفە کەئەمڕۆ بەڕێکەوت لەخەزینە کۆبوونەوەیان هەبوو. دەستیان لەکار کێشایەوەو بەپەلە بۆ رزگاری





ولات بەڕێ کەوتن, هەموو ئەو کەسانەی بەئازادی هاتونەتە دونیاوە تەنانەت ئەوانەش کەلەخراپترین چینی کۆمەڵن, بەکۆمەڵ رێگای مەیدانی گشتیان گرتۆتەبەر. بۆ کام پیاوی رۆمیە کەئەم میحرابانەو دیمەنی ئەم شارەو ئەم ئازادیەی کەهەمانەو ئەم هەتاوەی کەدەوروبەری ئێمە رووناکدەکاتەوە ئەم سەرزەویەی کەنیشتمانی هەموومانە خۆشەویسترین سامانەکان‌و سەرچاوەی هەموو خۆشی‌و شادیەکانی نەبێت؟ باوکانی بەڕێز: لەو هەڵسەنگاندنەی کەسەبارەت بەهێزی داکۆکیکارانی نیشتمان دەیکەم, ناکرێت کەچینی کۆیلە ئازادکراوەکان لەبەرچاو نەگرم. لەوکاتەوە کەئەم کەسانە بەهۆی تێکۆشان‌و فیداکاریەوە ناونیشانی پڕ شانازی هاولاتیانی رۆمایان بەدەستهێناوە, شارێك کەهەنوکە ژمارەیەك لەچینە بالاکان کەلەوێدا چاویان بەژیان هەڵهێناوە, دەیانەوێت خاپووری کەن, ئەوان (کۆیلە ئازادەکان) حەز دەکەن‌و وەك نیشتمانی خۆیان خۆشەویستی بۆ دەردەبڕن, لەکۆتایدا ئەو خۆشەویستیە هانیان دەدات داکۆکی لەماڵ‌و یاسا مەدەنیەکان‌و ئازادی کەگەورەترین سامانە, بکەن. لەپاش تاوتوێکردنی رۆحیەی چینە جیاوازەکانی کۆمەڵ کەسەرقاڵی چینی کۆیلەکان دەبین تەنانەت لەنێوان ئەو کۆیلانەدا کەژیانێکی دژوارو تەحەمولنەکراویان هەیە کۆیلەیەك نییە کەنەفرەت لەپیلان نەکات‌و ئارەزووی مانەوەو بەردەوامی کۆماری نەبێت, ئەگەر لەڕزگارکردنی ولاتدا بەکردەوە بەشداری نەکەن, بەلام ئارەزووی ناخیان رزگاری نیشتمانە. لەوپڕوپاگەندانەی کەچەند رۆژ لەمەوبەر بلاوکرایەوە نیگەران نەبن, لەم چەند رۆژەدا "لانتلۆس" چەند کەسێکی بۆ ماڵی هەژاران‌و دوکانە خاوەن پیشەییەکان ناردووە بەو هیوایەی کەبەزەبری پارە دەست بەسەر رۆحی ساکارو پاکژیاندا بگرێت. بەلام

لەنێوان ئەواندا کەسێکی گومڕا پەیدانەبوو کە خۆشەویستی خۆی بەو شوێنە ئارامەی (کەلەوێ کاری ڕۆژانەو پێداویستیەکانی ئەوان دابیندەکات‌و جێ‌و بانەکەی دەپارێزێ‌و شوێنی ئارامی‌و حەوانەوەی ئاسایشی هەمیشەییەتی) لەبیر بباتەوەو دوچاری فێڵ‌و فریودانبێت[31]. من دەبێت ئەم بابەتە ڕابگەیەنم کەچینی پیشەگەرو دروستکار بەهۆی بەرژەوەندی ئەو پێگەیەی کەهەیەتی خوازیاری ئارامی‌و ئاسایشن, بەرژەوەندی پیشەکەیان‌و خودی ئەوکارەی ئەوان پەیوەندی بەوەوە هەیە کەکۆمەڵێکی زۆر کڕیاری هونەرو پیشەکەیان بن. ئەگەر ڕۆژێك کارخانەیەك دابخرێت خاوەنەکەی لەسوودی ڕۆژانەکەی بێبەشدەبێت‌و ژیانی دژوار دەبێت, کەوابێت چۆن دەکرێت لەگەڵ پیلانێکدا هاوئاهەنگ بن کەئەنجامەکەی لەناوچوونی کارگەکان‌و لەناوچوونی خەڵکیە, هەرگیز ئەوانە تەسلیمی چارەنوسێکی لەوجۆرە نابن.

باوکانی بەڕێز: شایەدو بەڵگە نزیکەکان ئەوە دەردەخەن کەمیللەت لەپشتگیریکردنی (نوێنەرەکانی خۆیان) غافڵنابن‌و ئێستا کاتی ئەوە هاتووە کەنوێنەرانی میللەتیش بیسەلمێنن کەلەچارەنووسی خەڵکی غافڵنابن.

کۆنسوڵەکەتان لەهەمبەر مەترسی‌و دەسیسەیەکی زۆردا وەستاوەو ململانێی کردووەو, ئەگەر چەندان جار گیانی خۆی لەمەرگ ڕزگارکردووە تەنها بۆ پاراستنی گیان‌و هێشتنەوەی ژیانی

---

[31] لەدەوروبەری "ئەنجومەنی پیران" چەندین دوکانداری لێبوو. تەنانەت ژمارەیەك لەخاوەن پیشەکان وەك (بەرگدروو, پینەچی‌و ...هتد) لەسەر مێز یان شێوە عەرەبانە دادەنیشتن‌و ئیشیان لەسەر دەکرد. شیشرۆن لەوکاتەدا بەدەست ئاماژەی بۆ ئەو کەسانە دەکرد.





خۆی نەبوو, هەوڵ‌و تێکۆشانی بۆ ئەوەبوو کەئێوە ڕزگار بکات. ئەی ئەو کەسانەی ئازایەتی‌و خۆڕاگریتان لەگەڵ یەکدا یەکسانبوو. هەموو چینەکانی کۆمەڵ بۆ کامەرانی‌و ڕزگاری وڵات یەك ڕۆح‌و یەك دەنگ‌و یەك ئارەزوویان هەیە. وڵات کەلەلایەن ژمارەیەك لەڕۆڵەکانیەوە هەڕەشەی لێدەکرێت, دەستی پاڕانەوەتان بۆ ڕادەکێشێ‌و داوای یارمەتیتان لێدەکات, ژیانی خەڵکی, کاپیتۆڵ‌و میحرابەکانی خوداکان, وە ئاگری نەمری پیرۆزی "وستا"و میحرابەکانی‌و شوێنەواری خوداوەندە مەزنەکان‌و هەموو ماڵەکانی ئەم شارەتان پێدەسپێرێت, ئێوە ئەوە لەبەرچاو بگرن کەدەبێت ئەمڕۆ دەرهەق بەگیانتان‌و ژن‌و منداڵەکانتان‌و دەربارەی دارایی‌و سامانی یەك بەیەکی خەڵکی‌و پاراستنی دەزگای خێزانی خەڵکی ڕۆما, ڕای خۆتان دەربڕن‌و داوەری بکەن, ئێوە ئەمڕۆ ئەو شتەی کەهەمیشە بەدەست نایەت, لەبەردەستاندایە ڕابەرێکتان هەیە کەبوون‌و هەستی خۆی لەبیر بردۆتەوە تا هەستەکانی زیاتر ئاراستەی ئێوە بکات. پیگەیەکی باشتان بەدەستهێناوە کەپێشینەی نەبووە بۆ یەکەمجارە کەهەموو خەڵکی‌و هەموو چین‌و توێژەکانی کۆمەڵ هەست‌و ئارەزووی هاوبەشیان هەیە.

بیر بکەنەوە لە مەزنی‌و گەورەیی ئەو تێکۆشانانەی کەبۆ بناغەی ئەم کۆمارە کراوەو بیهێننە بەرچاوتان کە چ فیداکارییەك بەکاربراوە تا بناغەی ئازادی دامەزراو چ تێکۆشانێك کرا تا لەپەنا پارێزگاری خوداوەندەکان, ئیمپراتۆریەکەمان بەو پلەو پایەیەی ئێستای گەیشت. ئەوانە دەیانویست لەشەوێکدا ئیمپراتۆری ڕۆما لەگەڵ ئەو هەموو مەزنییەیداو خەڵکی‌و ئازادیش بەجارێك بسڕنەوەو لەناوییبەن. ئەمڕۆ نۆرەی ئێوەیە ئەرکی خۆتان ئەنجام بدەن, ئێوە

دەبێ ڕێگایەك هەڵبژێرن كەكەسانی خائین لەداهاتوودا نەتوانن تەنانەت بیر لەخیانەتكردن بكەنەوە. باوكانی بەڕێز: باسكردنی ئەم بابەتانە بۆ هانداندو دنەدان نییەو ئازایەتی و هەستەكانتان قەرزاری كردووم, بەڵام لەو ڕووەوە كەمن (كۆنسولم), كۆمار ئەو ئەركەی پێسپاردووم كەبێمە دەنگو قسەبكەم.

باوكانی بەڕێز بەرلەوەی بابەتەكەم تەواو بكەم, كورتەیەكتان دەربارەی خۆم پێدەڵێم, دوژمنەكانی كۆمار كەژمارەیەكی زۆرن, لەئەنجامی كارەكانمدا دوژمنایەتیم لەتەكدا دەكەن, تەواوی ئەوانە ئەو دوژمنانەمن كەبەئاشتی قایلنابنو لاوازیان ئەو نەفرەتەیان قەرەبوو دەكاتەوە كەهەیانە لێمو تەنها هەستی منیش دەرهەق بەوكەسە بێئابڕوو بچووكو سووكانەیە, گریمان ئەو كەسانە ڕێزیان لەئەنجومەنی پیرانو یاساكان نەگرت, كەتاكە پشتیوانمنو, بەهێزی خیانەتو بێشەرمییەوە دژم وەستان دیارە كردەوەو بیروڕاكانم لەبەرامبەریاندا ناگۆڕێت, لەمەوە كەمەرگ تەنها چەكی تۆقاندنیانە دژم, لەڕاستیدا ئەو چەكە چارەنوسێكە كەهەمووان چاوەڕێی دەكەین, بەڵام ئەو شانازییانەی بەپەسەندكراوی پێشكەشتان كردووم تەنها بۆمن بەشیاو دانراوە, هەزاران كەس بەهۆی خزمەتكردنی كۆمارەوە ڕێزیان لێگیراوە, بەڵام ئەوە تەنها منم كەنەك بەهۆی خزمەتكردنەوە, بەڵكو وەك ڕزگاركەری كۆمار لەشانازیو ڕێزتان بەهرەمەندبووم. شانازی بۆ "سیپیۆنی گەورە" كەبەكامڵی خۆی توانی "ئانیبال" ناچاربكات ئیتاڵیا بەجێ بهێڵێو بۆ ئەفەریقا بگەڕێتەوە. شانازی بۆ "سیپیۆنی ئەفەریقا" كە "كارتاژ"و "نوماسن"ی وێرانكرد, ئەو دوو شارەی كە لەكینەتۆزترینو خراپترین دوژمنانی ئەم میللەتە بوون, یادی "پوڵ ئەمیڵ"و خزمەتەكانی بكەنەوە كە "پرسە" ئەو سوڵتانەی





ڕۆژگارێك ئەو هەموو دەسەڵاتو ناوبانگەی هەبوو بەزنجیر بەستەوەو لەپێش گالیسكەكەیەوە رایدەكێشا, نەمریی بۆ "ماریۆس" كەتوانی دووجار ئیتاڵیا لەهێرشی بەربەریەكانو پەلاماری بیانییەكان ڕزگار بكات, لەسەرو ناوی ئەم كەسە بەناوبانگانەوە (پەمپە) دادەنێین. سەركەوتنو كارە باشەكانی لەپانتایی تیشكی خۆر دەچنو سنووریان نییە, لەنێوان شانازییەكانی ئەم كەڵەپیاوانەدا جێگایەك بۆ شانازییەكانی منیش هەیە, چونكە گەر ئەوان بەداگیركردنو سەركەوتن توانیان دەست بەسەر سەرزەمینە تازەكاندا بگرنو بەم بۆنەوە ڕێزیان لێگیرا, منیش توانیم نیشتمانێك بۆ ئەو سەركردە ئازایانەی كەلەدەرەوە سەرقاڵی سەركەوتنەكانیان بوون بپارێزم تا بتوانن سەركەوتوانە بۆ باوەشی ئەو نیشتمانە بگەڕێنەوە, كامەرانی ئەو كەڵە پیاوانەی كەلەدەرەوەی وڵات سەركەوتن بەدەست دەهێنێ زیاترە لەوكەسەی كەلەناوەوەی كۆماردا سەركەوتن بەدەست دەهێنن, چونكە دوژمنانی دەرەوە پاش تەسلیمبوونو شكستو دیلێتی لەهەمبەر سەركەوتواندا هەست بە مافناسی توانایان دەكەن, بەڵام ئەوانەی لەژێر كاریگەری شێتانەی ترسێنەردا, جەنگ لەناوەوەڕا لەتەك نیشتماندا دەكەن, بەئاشتی قایلنابن. هەر هەوڵو كۆششێك بۆ دامركاندنەوەی ئاگری ڕقیان بێهودەیە, هیچ یەك لەترسو خۆشەویستی ناتوانێت ئەو چەكەیان لەدەست وەربگرێت. هەر لەم ڕووەوە دەبێت بەناچاری لەتەك ئەوانەدا درێژە بەجەنگ بدەمو ئەم جەنگەش بێكۆتاییە. لەگەڵ ئەوەشدا من هیچ ترسێكم لەوان نییە چونكە پشتیوانی ئێوەو هەموو كەسە چاكەكان بیرەوەری ئەو كارەساتانەی كەهەردەم لەبیری خەڵكی دونیاو بەدڵنیاییشەوە لەبیری ئەو میللەتە گەورەیەی بەدەستی ئێوە ڕزگاری بوو, بەنەمری

دەمێنێتەوەو، بۆ منو خێزانەکەشم بۆ هەتا هەتایە قەڵایەکی پتەوە. هیچکات هێزێك لەبەرامبەر یەکێتی ئەنجومەنی پیرانو جەنگاوەرەکانی رۆمدا خۆی ناگرێت هەرگیز هەرەشەی خەڵکانی شەرەنگێز ئەو یەکێتییە هەڵناوەشێنێتەوە کەلەنێوان خەڵکە باوەڕدارەکاندایە.

ئەی باوکانی بەڕێز: گەرچی لەپێناوی رزگارکردنی گیانتانو مانەوەی وڵات هەرچییەکم کردبێ چاوەڕێی پاداشت نەبووم هەنووکەش کە لەنێو تەواوی هەڵاوردنەکاندا سەرکردایەتی سوپاو فەرمانڕەوایی ویلایەتێکم(32) پێدەدرێ، ناتوانم خۆم لەدابینکردنی خەرجی ئەو پێشوازیکردنە بەدووربگرم (لەگەڵ ئەوهەموو تێکۆشانانەمدا) ئەمەش لەحکومەتێکی ویلایەتیدا شتێکی حەتمیە، و هەروەها بۆ قەرەبووکردنەوەی فیداکاریەکانو لەخۆبوردنە لەڕادە بەردەکانم بۆ پاداشتدانەوە لەهەمبەر ئەو چاودێریانەی کە ماندو نەناسانە ئەنجاممداوەو ئەمڕۆ میللەت لەبەرەکەتەکەی دەخوات، هیچ شتێکم لێتان ناوێت جگە لەوەی بیرەوەریەکانی ئەم رۆژە مێژووییانەو سەردەمی کۆنسوڵایەتیەکەم هەمیشە لەیادەوەریتاندا بهێڵنەوە، تا ئەوکاتەی بیرەوەریەکانی ئەم رۆژانەم لەرۆحو زەینتاندایە خۆم لەنێو حەسارێکی پتەودا کەلەهەموو لایەکەوە پارێزراوە، دەبینمەوە. بەڵام ئەگەر رۆژێك تاوانباران سەرکەوتنو ئارەزووەکانیان لەناوبردم، ئەو "کوڕە(33)"م بەئێوە دەسپێرم کەلە جۆنەدایە تائەوکاتەی

(32) بریاربوو شیشرۆن لەپاش تەواوبوونی ماوەی "کۆنسوڵا"یی حکومەتی مەکدۆنیا بگرێتە ئەستۆ بەڵام بۆئەوەی ئەنتۆینۆسی هاوڕێی رازیکات چاوی لەو پلەیە پۆشیو هەر لەرۆما مایەوە.

(33) مارکۆس، کوڕی شیشرۆنە لەساڵی 64 پ.ز لەدایکبووە.



بیخەنەوەیادی کەژیانی قەرزاری باوکێکە بۆ رزگاری خەڵکی خۆی کردە قوربانیو هیچ مەترسیەك ناتوانێت هەرەشە لەرۆحو شانازیەکانی بکات.

بەڵێ باوکانی بەڕێز؛ ئەمڕۆ ئێوە بیروڕا دەربارەی چارەنووسی خۆتان دەردەبڕن. دەربارەی ژیانی میللەتو ژیانی ژنانو منداڵانو ماڵەکانو دەزگا خێزانیەکانی خۆتانو مانەوەی میحرابە پیرۆزەکانو چارەنووسی ئەم شارەو ئیمپراتۆریەتو ئازادیو ئیتالیاو کۆمار بڕیار دەدەن. هەر بەو ئازایەتیو خۆڕاگریەوە بیروڕاکانتان دەربڕن کەلەدانیشتنی یەکەمدا رێکتانخست. ئێوە کۆنسوڵێکتان هەیە کەلەڕاپەڕاندنی کارە پەسەندکراوەکانتاندا لە گوێڕایەڵیو ئەنجامدانی فەرمانەکانتان هیچ باكو مەترسیەکی نیەو تەمەنو ژیانی لەم رێگەیەدا داناوەو توانای ئەنجامدانی کارەکانتانی هەیە.





## زنجیرەی بڵاوكراوەكانی خانەی وەرگێڕان لە ساڵی 2004

| ژ | ناوی كتێب | زمان | نووسەر | بابەت | ساڵی دەرچوون | وەرگێر |
|---|---|---|---|---|---|---|
| 29 | رۆشنبیرو دەسەڵات | عەرەبی | سعدالدین ابراهیم | رۆشنبیری | 2004 | هەڵكەوت عەبدوڵلا |
| 30 | شانۆ لە چەند وتارێكدا | عەرەبی | عەونی كەڕومی | شانۆیی | 2004 | پەروەر نەجمەدین |
| 31 | ستراتیژیی سەربازیی | فارسی | ریچارد كاگلەر | سیاسی | 2004 | دلێر میرزا |
| 32 | نامەیەك دەربارەی لێكبوردن | فارسی | جۆن لۆك | فەلسەفی | 2004 | شۆڕش جوانڕۆیی- فەرشید شەریفی |
| 33 | مەولاناخلیدو تەریقەتی نەقشبەندی | فارسی | سەید طاهر هاشمی | فیكری | 2004 | دلێر میرزا |
| 34 | سێ شانۆ نامە | عەرەبی | جان كۆكتۆ ئۆین ج. ئارنۆ میشێل دی. ئۆنامۆنۆ | شانۆی | 2004 | هەورامان قانع |
| 35 | را پۆرتی برۆدی | فارسی/ عەرەبی | خۆرخە لویس بۆرخس | چیرۆك | 2004 | یاسین عومەر |
| 36 | بیرەوەرییەكانی هەڵەبجە | كوردی | بەكر حەمە صدیق | مێژووی | 2004 | بەكرحمە صدیق/ كوردی<br>دلێرمیراز/ فارسی<br>م. حسن عبدالكریم<br>ئینگلیزی/ فوئاد تاهیر |
| 37 | رەهەندەكانی ناسیۆنالیزم | فارسی | كۆمەڵێ نووسەر | نەتەوەیی | 2004 | ئارام جمال |
| 38 | ریفراندۆم باشترین شێوازی خەباتە | سویدییەوە | تۆم گولبێری | سیاسی | 2004 | ئیدریس ئیبراهیم |
| 39 | شانۆی پانتۆمایم | عەرەبی | بورهان قەرەداخی | شانۆی | 2004 | بورهان قەرەداخی |
| 40 | گوڵەزەر | عەرەبی | جەنگیز ئیمتاتۆف | رۆمان | 2004 | جەوهەر كرماج |
| 41 | پاژنەی ئاسنین | عەرەبی | جاك لەندەن | رۆمان | 2004 | كەمال غەمبار |
| 42 | خەناوكەیەك بۆ سەر میناز | فارسی | ئەحمەدخان ئەبوبەكر | رۆمان | 2004 | ئەبوبەكر خۆشناو |
| 43 | ئەندامێكی میت | توركی | محەمەد ئەیمور | سیاسی | 2004 | ئارام عەلی عەزیز |
| 44 | كورتترین رێگەی سەركەوتن | فارسی | رۆبێرت ئۆریلی | دەروونناسی | 2004 | سالار عەبدلرەحمان |
| 45 | كۆماری مهاباد | كوردی | عەبدوڵلا ئەحمەد رەسول | مێژوویی | 2004 | سەلمان عەلی |

## بەرهەمی داهاتووی خانە بۆ بەردیدی خوێنەرانی ئازیز

| ژ | ناوی كتێب | ناوی نووسەر | ناوی وەرگێڕ |
|---|---|---|---|
| 1 | مەولانا خالیدو تەریقەتی نەقشبەندی | سید طاهری هاشمی | دلێر میرزا |
| 2 | سەرچاوەكانی زانایو نەزانی | كارل پۆپەر | ناصری سەلاحی |
| 3 | یادەوەریەكانی ئەندامێكی میت | محمدی ئەیموری | ئارام علی عەزیز |
| 4 | كاریگەری هەڵچوونو لەبەرپرسێتی تاواندا | همداد مجید علی | دلێرمیرزا |
| 5 | دەوڵەتو كۆمەڵگەی مەدەنی | گرامش | مامەند رۆژە |
| 6 | ئازارەكانی هونەرمەندێك | یوسف فرانسیس | ئاری بابان |
| 7 | نیوەكەی تری جیهانو چەند جیرۆكێك | چەند نووسەرێك | نوری سەعید قادر |
| 8 | جینۆساید لەباكوری عیراق | رێكخراوی مافی مرۆڤ | محمد حمە سالح |

